# إبن تيمية
# و
# إسلامية المعرفة

د. طه جابر العلواني

ترجمة:

حسين محمد إبراهيم

مركز الزهاوي للدراسات الفكرية

المعهد العالمي للفكر الإسلامي ١٤

# ئیبن تەیمیە
# و
# ئیسلامیێتیی زانست

نووسینی:

د. تەها جابر عەلوانی

وەرگێرانی:

حسێن موحەممەد ئیبراهیم

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی ١٤

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
(١٤)

# ئیبن تەیمیە و ئیسلامێتیی زانست

نووسینی:
د. تەها جابر عەلوانی
وەرگێڕانی:
حسێن موحەممەد ئیبراهیم

چاپی یەکەم
١٤٣٢ ک ٢٠١١ ز

مافی لەچاپدانی پارێزراوە

ناوی کتێب: ئیبن تەیمیە و ئیسلامێتیی زانست.

نووسینی: د. تەها جابر عەلوانی.

وەرگێڕانی: حسێن موحەممەد ئیبراهیم.

لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی و

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، ژمارە (١٤).

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (٢١٧٢)ی ساڵی (٢٠١١)ی دراوەتێ.

چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١١.

چاپخانە: شڤان.

تیراژ: (١٠٠٠) دانە.

ئیمەیلی پەیمانگا: iiitkurdistan@yahoo.com

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە و میهرەبان، داوای لێخۆشبوون و ڕێنمایی لێدەکەین، پەنا دەگرین بە خوای گەورە لە شەڕانگێزیی نەفسمان و خراپیی کردەوەکانمان، هەروەها ڕەحمەت و گەورەیی بڕژێت بەسەر گیانی پاکی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ و هاوەڵانی و ئەوانەی بانگەوازەکەی ئەویان هەڵگرتووە و شوێنی سوننەتەکانی ئەو کەوتوون و لەسەر ڕێی ئەون هەتا ڕۆژی دوایی.

بە هەلی دەزانم لە دەرکردنی ئەم کتێبەدا هەندێك شت ڕوون بکەمەوە کە پێویستیان بە ڕوونکردنەوەیە سەبارەت بە شێخولئیسلام (ئیبنو تەیمیە) و پەیوەندییەکانی ئێمە بە هزر و نووسین و قوتابخانە چاکسازییەکەیەوە، ئەم ڕوونکردنەوانە پێموایە زۆر گرنگن لەم قۆناغەی ئێستادا، کە ئوممەتی ئیسلامیی پێویستی زۆری بە بیری زیندوو، زیادکردنی ڕەصیدی فیکریی ڕاست و دروست هەیە، کە گەلی موسڵمان بۆی ماوەتەوە لە قوتابخانە ئیسلاحییەکان و سەرکردە فیکرییە ژیرەکانیەوە، دەتوانین بڵێین پێشەنگی ئەو سەرنج و تێبینییانەم ئەمانەن:

١ـ دەوڵەتی عوسمانی کە سەرکردایەتی هەموو جیهانی ئیسلامیی کەوتە دەست ـ لە دوا سەردەمی ئیبنو تەیمیە ـ پەیڕەوی مەزهەبی حەنەفی بوون لە فیقهدا و ئەشعەری بوون لە مەزهەبی کەلامی و عەقیدەدا، یان "ماتریدی"[1] بوون، پێدەچێت کە سوڵتانەکانیان هەندێك مەیلی سۆفیگەرانەیان تێدا بووبێت لە هەڵسوکەوت و

[1] الماتريدية: نازناوی ماتوریدیە، کە ناوی موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی مەحمود، ناسراوە بە ئەبومەنصوری ماتوریدی، لەدایکبووی (ماترید)ە، کە گەڕەکێکە لە سەمەرقەند، مێژووی لەدایکبوونی نەزانراوە، بەڵام لە ساڵی (٣٣٣ك) وەفاتی کردووە، ناوبراو لەگەڵ ئەبوحەسەنی ئەشعەری هاوچەرخ بووە و لە ڕووی فیکرییەوە زۆر نزیك بووە لێوەی، لە زۆرێك لە ڕاوبۆچوونە کەلامییەکاندا هاوڕان، بەڵام لە هەندێك مەسەلەدا لە موعتەزیلەکانەوە نزیکترە، زۆرێك لە حەنەفییەکانی "ما وراء النهر" کاریگەر بوون پێی و شوێن ڕایەکانی کەوتوون.

ڕەفتاریاندا، ئەم تایبەتمەندییانە لە بنەما سەرەکییەکانیدا تا ڕاددەیەکی زۆر درێژەپێدەری ئەو حاڵەتە بوو کە لە قۆناغی سەردەمی عەبباسیی سێهەم و دوای ئەوان لە دەوڵەتی مەمالیکدا لەئارادا بوو.

شێخولئیسلام ئیبنوتەیمیە لەو زانایانە ئەژمار دەکرێ کە ڕاجیاییان هەبووە لەگەڵ بۆچوونەکانی دەوڵەت لە سەردەمی خۆیدا، بۆیە ڕێگەیەکی دیکەی کێشابوو لە مەسەلەکانی بیروباوەڕ و فیقه و هەڵسوکەوتدا بۆ خۆی و بۆ قوتابخانەکەی، ئەم کتێبەی ئێمەش کە پێشکەشتانی دەکەین بە کورتی گرنگترین بۆچوونەکانی شێخولئیسلامی گرتۆتەخۆ، کە خۆی دەبینێتەوە لە هەڵبژاردنی مەزهەبی پێشین (سلف) لە عەقیدە و بیروباوەڕدا، کە ئەویش ڕاوەستاوە لەسەر یەکتاپەرستی لە (ألوهية) و (ربوبية) و (سیفات و ناوە بەرزەکانی خوای گەورە)دا، وەسفکردنی خوای گەورە بە هەموو ئەو شتانەی کە وەسفی خۆی پێکردووە بەبێ پەکخستنیان و تەئویلکردنیان و شوبهاندنیان بە شتی دیکە، هەروەها لە فیقهی ئیسلامییدا هەر پەیڕەوی سەلەفی هەڵبژاردووە، کە پوختەی ئەم مەزهەبە خۆی لە پەیوەستبوون بە بەڵگەکانەوە دەبینێتەوە بەبێ ڕەچاوکردنی ئەو کەسانەی هاوڕان لەگەڵی، یان پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئەویان هەیە لە زانایان، قسەی زانایان ڕادەنوێنرێ لەگەڵ قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، جا ئەو ڕایەی کە لەگەڵ قورئان، یان سوننەتدا بێتەوە، ئەو وەریدەگرێت و کاری پێدەکات و ئەو ڕایەی لەگەڵ ئەم دوو سەرچاوەیەدا نەهاتەوە وەریناگرێت، چونکە بەم دوو سەرچاوەیە ڕاستی و دروستی و چەوتیی نەپێکانی قسەی زانایان دەزانرێت و کاری پێدەکرێت.

بەڵام لە هەڵسوکەوتدا ڕەحمەتی خوای لێبێت، ڕێگەی تەسەوفی سوننەتییانەی هەڵبژاردبوو، کە خۆی دەبینێتەوە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەری هەڵبژێردراو ﷺ و دەستگرتن بە سوننەتەکانیەوە، کە دەکرێ مەبەستەکانی کورت بکەینەوە لەوەی کە بریتییە لە: "لە خواترسان لە پەنهان و ئاشکراییدا و شوێنکەوتنی سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ لە گوفتار و کرداردا و ڕازییبوون بە بەشی خوای گەورە لە کەم و زۆردا،

یادی خوا و پەیوەستبوون پێیەوە لە کاتی خۆشیی و ناخۆشییدا و دوورکەوتنەوە لە دنیای لەخۆباییبوون و گەڕانەوە بۆ دنیای مانەوەی هەتاهەتایی، ڕەواندنەوەی هەستکردن بە وەحشەت و تەنهایی بە خۆشەیستی خوا و لابردنی خەفەت بە دڵخۆشبوون بە ناسینی خوا، لابردنی دڵتەنگیی و زەبوونیی بە زیکر و یادی بەردەوامی خوای گەورە و گەڕانەوە و ڕاسیگۆیی و ئیخلاس بۆ ئەو لە هەموو شتێکدا".

لەبەر ئەوەی ئیبنو تەیمیە زۆر کات پێچەوانەی بۆچوونەکانی دەوڵەت بوو، هێرشی دەکردە سەر ئەو بیروبۆچوونانەی کە خەڵکیان لاڕێ دەکرد لەسەر بەرنامەی پێشین (سلف) ـ وەك خۆی دەیبینی ـ، تووشی دوژمنایەتییەکی زۆر گەورە بووەوە لە ژیانیدا و تەمەنی پڕە لە جۆرەها ڕووبەڕووبوونەوە و خەبات بە شمشێر و بە قەڵەم.

٢ـ کاتێك شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب (١١١٥هـ ـ١٢٠٦هـ / ١٧٠٣ـ ١٧٩٢م) پەیدا بوو، بیروبۆچوونەکانی ئیبنو تەیمیەی هەڵگرت و ڕووی کردە قوتابخانەکەی ئەو، ویستی لەسەر ڕێڕەوی ئەو بڕوا لە چاکسازییدا، بەوەی خەڵکی بگێڕێتەوە سەر ڕێبازی یەکەم و خەڵك جێگیر بکات لەسەر ئەوەی کە پێشینان (سلف) لەسەری بوون، بە بانگەوازکردن بۆ دەستگرتن بە قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەویش ڕووبەڕووی هەمان ئەو ناکۆکی و دژایەتییە بووەوە کە شێخولئیسلام ئیبنوتەیمیە تووشی بوو، بەڵام ئەو لەگەڵ بەرپرسان و دەسەڵاتی ڕەسمیی دەوڵەتی عوسمانیی و دامەزراوە مەزهەبیی و سۆفیەکانی چواردەوری تورکەکاندا، دەوڵەتی عوسمانی هەموو هێز و تواناکانی خۆی بەکارهێنا بۆ ڕێگرتن و بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ ئەم بانگەوازەدا و لەباربردنی، تەنانەت بە بەکارهێنانی هێزی چەکداریشەوە، دەوڵەتی عوسمانیی لەقەبی (وەهابی و وەهابییەکان)ی لێنان و ئەم لەقەبەی لە ناو خەڵکیدا بڵاوکردەوە بۆ ناشیرینکردن و دوورخستنەوەی خەڵك لە پەیڕەوکردنی ئەم مەزهەبە و پاراستنیان لە کاریگەر بوون بە بانگەوازەکەیەوە، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی تایبەت نەبن بە هێزێکی یارمەتیدەر و پاڵپشت بۆ ئۆپوزسیۆنی سیاسیی عەرەبیی ئەو سەردەمە، ئەو ئۆپۆزسیۆنەی کە لەو سەردەمەدا ئەم

مەزهەبەی کردبووە زمانحاڵ و دەمڕاستی خۆی و هەڵگری پڕۆژەکانی لە چاکسازییدا، بەڕاستی دەوڵەتی عوسمانیی سەرکەوت لە هێنانە کایەی کەش و هەوایەکی ترسناك لە بانگەوازەکەی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لەناو سۆفییەکاندا و لە ناوەندی زانایانی مەزهەبە جیاجیاکاندا و دورخستنەوەی کۆمەڵی مسوڵمانان لەم بانگەوازە و هەڵگرەکانی، زۆر هۆکاری یارمەتیدەر هەبوون کەشوهەوایەکی وایان دروستکرد، کە بانگەوازە یەکتاپەرستییەکەی شێخ موحەممەد عەبدولوەهاب گەمارۆ بدرێ کە نوێنەرایەتی جۆرێك لە زیندووکردنەوە و تازەکردنەوەی بیروبۆچوونەکانی شێخولئیسلام ئیبنو تەیمیە و بانگەوازەکەی بۆ یەکتاپەرستیی پاك و بێگەرد و قەبوڵنەکردنی بیر و بۆچوونە حلول و ئیتحادی جەبری و شیرکییەکانی دەکرد بە هەموو جۆرەکانییەوە و جەختی لەسەر کەرامەت و ڕێزی مرۆڤ و بەرپرسیاریەتی دەکردەوە، جەختی لەوە دەکردەوە کە مرۆڤ خۆی لە کردەوە و هەڵسوکەوتەکانی بەرپرسیارە، پێغەمبەران و پیاوچاکان و زانایان گوناهی شوێنکەوتوان و ئەو کەسانە هەڵناگرن کە لێیانەوە نزیکن، مرۆڤەکان تەنها بەروبوومی هەوڵ و کۆششەکانی خۆیان وەردەگرن لە لای خوا، نێوانداری (توسل) بۆ خوا قەراردان، نابێت تەنها بەو شتانە نەبێت کە دروستە نێوانداری (توسل)یان پێبکرێت بۆ لای خوا، ئەصڵ لە ئیسلامدا ئیجتیهاد و کارکردنی ڕاستەوخۆیە بە دەقەکان لە لایەن خەڵکەوە و تەقلید و شوێنکەوتنی ڕای زانایەك، یان چەند زانایەك، بەبێ زانین و ڕازی بوون لە بەڵگەکەی، تەنها بۆ کاتی ناچارییە، یاخود بۆ کەسی ناچارە کە ناتوانێ ڕاڤە و وردبینی بکات لە بەڵگەکاندا و حوکمی شەرعییان لێهەڵێنجێت، بەڵام کەسێك وانەبێت بۆی نییە ڕێگەی ئەوانە بگرێت کە شوێن ڕا و بۆچوونەکان دەکەون بەبێ بینین و بەڵگەکان و لێکدانەوەکانی، هەروەها هیچ فەتوا و ڕایەك پیرۆز نییە کە بنیات نەنرابێت لەسەر قورئان، یان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، یان کۆڕا (إجماع)ێکی رەوای موسوڵمانان.

لەبەر هەموو ئەمانە و لەبەر پەیوەندیی پتەوی بانگەوازەکەی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب بە بانگەواز و ڕایەکانی ئیبنو تەیمیەوە، دەبوو سومعە و ناوبانگی

ئیبنو تەیمیەش لەکەدار ببێ بەم جۆرە بانگەشە و ناوزڕاندنانەوە، بۆیە وا بڵاوکرایەوە کە شێخولئیسلام ئیبنو تەیمیە و شوێنکەوتووەکانی لە موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب و هاوشێوەکانیان ڕێز لە پێغەمبەری خوا ﷺ ناگرن و پشتگیریی لێناکەن، ئەوەتا ئەوان ڕێگریی دەکەن لە نێوانداریی (التوسل) بە پێغەمبەرەوە ﷺ و ڕایەکی دیکەیان هەیە لە سەردانی مەزاری پیرۆزی کە جیاوازە لە ڕای باقی و زۆربەی موسوڵمانان، قەبر دەڕووخێنن و ڕێگری دەکەن لە کردنی مەزارگەکان بە مزگەوت، یان نێوانداریی (توسل) بە خاوەنەکانیان و زۆر شتی دیکە، کە لە ڕاستیدا بە کار و بۆچوونە چاکەکانی شێخولئیسلام و قوتابخانەکەی دادەنرێن، هەموو ئەمانە، یان زۆبەیان، دەچنە ژێر ئەو هەوڵ و تەقەلایانەی کە بۆ پاککردنەوەی یەکتاپەرستیی لە شتە هەڵپەسێراو و پیاهەڵواسراوەکان و توڕدانی بیروباوەڕی حلول و ئیتحاد و (وحدة الوجود ـ یەك پارچەیی بوون) و چەندەها بیروباوەڕی لاڕێی دیکە، هاندان بۆ ئەوەی دین و دینداری تەنها بۆ خوای گەورە بێت، ڕاستکردنەوەی هەڵسوکەوت و گێڕانەوەی هوشیاری بۆ ئەو ئوممەتەی کە دوور خرابووەوە لە هوشیاری بە هۆی زۆریی بیدعە و لادان لە ئیسلام، بەڵام لادانی فیکریی وایکرد کە چاکەکانی شێخولئیسلام و قوتابخانەکەی لە شێوەیەکی خراپەدا نیشان بدات، بۆیە زمانی حاڵی دەیوت:

إذا محاسني اللاتي آتيه بها　　　　كانت ذنوبي فقل لي كيف أعتذر؟!

واتە: ئەگەر ئەو چاکانەی کە ئەنجامیان دەدەم، ئەوانە گوناهەکانم بن، پێم بڵێ چۆن داوای لێخۆشبوون بکەم؟!

بۆیە ئەگەر هەموو شتێکم لەبیر بچێتەوە ئەوەم لەبیر ناچێتەوە کە چۆن مامۆستاکانمان لە عێراق لە قوتابخانە ئایینییەکاندا پێش پەنجا ساڵ، ئێمەیان ئاگادار دەکردەوە لە شوێنکەوتنی مەزهەبی وەهابی و ڕەچەڵەکە مێژووییەکەی، کە لە فیکری ئیبنوتەیمییە و ئیبنولقەیم و ئەوانی دیکەدا خۆی دەبینێتەوە و لەسەریان قەدەغە دەکردین سەیری کتێبەکانیان بکەین، تەنانەت یەکێك لە مامۆستاکانمان تەنها بەوە

وازی نەدەهێنا، بەڵکو داوای لێدەکردین کە ئەو وەڵام و بەرپەرچدانەوانە بخوێنینەوە کە لەسەر شێخولئیسلام و قوتابییەکانی نووسراون، تا ئێستاش لەبیرم ماوە لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بووم، یەکێك لە مامۆستاکانم زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە کتێبێك بخوێنمەوە لەسەر وەڵامدانەوەی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب، کتێبەکە ناوی (الصواعق الإلهية في الرد على الوهابية) بوو، کە کتێبەکە دراوەتە پاڵ نووسەرێك بە ناوی "سليمان بن عبد الوهاب"، جا مامۆستاکەم ـ داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەم بۆ ئێمە و بۆ ئەو ـ سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەم نووسەرە (سليمان) برای شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهابە و براکەی لە هەموو کەس زیاتر دەیناسێ. ئەوەی کتێبەکانی شێخ موحەممەدی نەخوێندبێتەوە و یەکەم جار ئەم وەڵامانەی ئەم کتێبە بخوێنێتەوە کە هی براکەیەتی ـ بەپێی قسەی نووسراوەکە ـ ئەوە ناتوانێ تەنانەت نزیك بێتەوە لە فیکری شێخ، چ جای کە کاریگەر بێت پێی و دیفاعی لێبکات، بەڵام من بەپێچەوانەوە ئەم هەڵوێستانەی مامۆستاکەم و ئەو کتێبە وەڵام ئامێزانەی کە سوور بوو لەسەر ئەوەی بیانخوێنینەوە، هانیاندام کە کتێبەکانی ئیبنوتەیمییە و هەموو ئەو کتێبانەی کە دەستمدەکەوتن لە کتێبی قوتابی و هەوادارەکانی، بخوێنمەوە، بەڵام نەمدەتوانی لە شارۆچکە بچووکەکەمان (فەلوجە) هیچ کام لەو کتێبانەم دەست بکەوێ.

کاتێك هاتمە بەغدا، دەستم کرد بەخوێندن لەسەر دەستی کۆمەڵێك زانای بەڕێز، لەوانە زۆر زانا شێخ ئەمجەد ئەفەندی ئەلزەهاوی و زۆر زانا شێخ موحەممەد فوئاد ئالوسی و زۆر زانا شێخ موحەممەد قزڵجی و زۆر زانا شێخ قاسم ئەلقیسی و زۆر زانا شێخ عەبدولقادر خەتیب، خوای گەورە هەموویان بە سۆز و ڕەحمەتی خۆی بپۆشێت، لەوێ دەمتوانی هەر کتێبێکم بوێ دەستم بکەوێت، لەو کتێبانەی پەیدام کرد، لە کتێبەکانی شێخولئیسلام ئیبنو تەیمیە، کتێبی فەتاواکەی کە (آل الذكير)ی خەڵکی (الزبير)ی ئەو کاتە چاپیان کرد بوو، هەروەها کتێبی (الجواب الصحيح) و کتێبی (القواعد النورانية) و لە هەمووی گرنگتر کتێبی (الصارم المسلول على شاتم الرسول)م

دەستکەوت، لە دوای خوێندنەوەیان بۆم دەرکەوت ئەو ڕێز و بەگەورەزانینەی ئەو هەیەتی بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ لە لای هیچ یەکێك لەوانە نەمبینیوە کە بانگەشە بۆ نێوەنداریی (التوسل) و سەردانی مەزارگەکان دەکەن و بە گرنگترین ڕواڵەت و دیمەنەکانی خۆشەویستی و ڕێزی پێغەمبەری خوای ﷺ دادەنێن، ئەمە سەرسامی کردم و پرسیاری زۆری بۆ دروستکردم لەبارەی هەڵوێستی مامۆستاکەم، شێخ عەبدولعەزیز سالم لە فەلوجە، کە گومانم لە زانست و زانیاریی و گەورەیی ئەو نەبوو، بەڵام پێم سەیر بوو چۆن پەی نەبردووە بە هەڵوێستی شێخولئیسلام ئیبنوتەیمیە لە ڕێی کتێبەکانیەوە و خۆی بێنیاز کردووە لەو مەسەلەیە، بە بیستن و خوێندنەوەی ئەو کتیبانەی وەڵامی ئیبن تەیمییە و قوتابییەکانیانی دەدەنەوە.

ڕۆژێکیان لە دەرسێکی شێخ موحەممەد فوئاد ئالوسی دا بووم، باسی شێخولئیسلام ئیبنو تەیمیە کرا، ئەویش (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ڕاستەوخۆ هێرشی کردە سەر، وەك چۆن مامۆستاکەم لە فەلوجە شێخ عەبدولعەزیز سالم، هێرشی دەکردە سەر (خوا لەویش خۆش بێت)، منیش ئەم جارەیان بێدەنگ نەبووم و وەڵامی شێخم دایەوە و گفتوگۆم لەگەڵ کرد، کەچی هەستم کرد تووڕە بوو و پێی وتم تۆ وەهابیت؟ ئەگەر وەهابیت دەتوانی لای من نەخوێنیت، منیش ڕۆیشتمەوە، بۆ ڕۆژی دوایی کتێبی (الصارم المسلول على شاتم الرسول)م بۆ هێنا و مۆڵەتم لێوەرگرت تەنها پێڕستەکەی بۆ بخوێنمەوە، ئەویش ڕێی پێدام و بۆم خوێندەوە، ئەو پیاوە چاوی پڕ بوو لە فرمێسك و وتی: ئەو کتێبەم با لا بێت چەند ڕۆژێك، منیش لام بەجێهێشت، پاش چەند ڕۆژێك هاتمەوە لای بۆ خوێندنی وانەی ڕەوانبێژیی (البلاغة)، هەستا بەرەو پیرم و ناوچەوانی ماچ کردم، پێم سەیر بوو، کەچی یەکسەر وتی: بەڕاستی تۆ منت نەجاتدا لە ڕقبوونەوە لەو پیاوە، هەتا ئێستا چاوم بە کتێبی وا باش نەکەوتووە لە بابەتی ڕێزگرتن و ملکەچی و خۆشەویستی بۆ پێغەمبەری خوا، زیان بە ئیبنو تەیمیە ناگەیەنێ ئەوەی وتوویەتی لەبارەی تەسەوف و نێوانداریی (التوسل)ەوە لەدوا ئەوەی کە لەم کتێبەدا لەبارەی پێغەمبەرەوە نووسیویەتی، لۆمەی ئەو زانایانەی کرد کە قسە و

قسەلۆك دەگوێزنەوە پێش دڵنیابوون لە ڕاستی و سەرچاوەكانی، پاشان (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، وتی: لەمەودوا دوعای خێر بۆ ئیبن تەیمییە زۆر دەكەم، ئەگەر پارەی پێویستم هەبوایە هەزارەها نوسخەم لەم كتێبە چاپ دەكرد و وەرم دەگێڕایە سەر چەندەها زمانی گەلانی مسوڵمان، بۆ ئەوەی مسوڵمانان بزانن چۆن پێغەمبەری خوایان خۆش بوێت و ڕێزی لێبگرن وەك ئیبنوتەیمیە، لەگەڵ ئەوەشدا داوات لێدەكەم بچیت بۆ كتێبخانەكانی بەغدا هەموویان، چەند نوسخەی ئەم كتێبە هەیە لە بازاڕدا بیكڕی لەسەر حیسابی من، بۆ ئەوەی دابەش بكرێ بەسەر خوێندكارانی زانستە شەرعییەكان و كتێبخانەكاندا، بۆ ئەوەی ببێتە كەفارەتی ئەو گومانە خراپەی كە بە شێخولئیسلام ئیبنوتەیمیەم بردووە، كە خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە و ئەویش پێغەمبەری خۆش دەوێت.

لەو كاتەوە كتێبەكانی شێخولئیسلام ئیبنوتەیمیە و قوتابییەكانی، لە ڕیزی پێشەوەی ئەو كتێبانەن كە دەیانخوێنمەوە و چاویان پیادەخشێنم.

كاتێك تێزەكەم ئامادەكرد لەسەر (فخر الدين الرازي وآراءه الأصولية وتحقيق كتابه المحصول)، بۆ ئەوەی بڕوانامەی دكتۆرای لەسەر بەدەست بهێنم، گەڕامەوە سەر لێكۆڵینەوە لە فیكری ئیبنوتەیمیە لە چوارچێوەی هەڵوێستی ئەو بەرامبەر (شيخ فخر الدين الرازي) و ئەشعەرییەكان، چۆن ڕەخنەم لە نەیارەكانی ئیبنو تەیمیە گرتبوو لەمەوپێش، ئاواش لەم تێزەدا ڕەخنەم لە ئیبنوتەیمیە گرت لە هەندێك هەڵوێستیدا لە بەرامبەر شێخ (فخر الدين الرازي) و ئەشعەرییەكاندا، ڕەخنەم گرتبوو لە هەندێك لە وتەكانی بەرامبەر ئەو و هەندێك لە قوتابییەكانی، كاتێك كە زانكۆی (إمام محمد بن سعود الإسلامية) حەزی كرد تێزەكەم چاپ بكات بە هەردوو بەشەكەیەوە ـ بەشی لێكۆڵینەوە و تەحقیقەكەی ـ ناردیان بۆ لای چەند وردبینێك، یەكێك لە وردبینەكان، تێزەكەی من زۆر تووڕەی كردبوو، تەنانەت نووسیبووی لە یاداشتەكەی بۆ زانكۆی ناوبراو كە: پەیمان (عقد)ەكەی ئەم نووسەرە هەڵبوەشێنرێتەوە و دەربكرێت لەم وڵاتە، لە نامەكەیدا جەختی كردبۆوە بۆ بەڕێوەبەری زانكۆی ـ ئەوكاتە ـ كە لەم وڵاتەدا

جێگەی کەسانێك نابێتەوە کە ڕەخنە لە شێخولئیسلام ئیبنو تەیمیە بگرێت، ڕەخنەکەی بەهەر مەبەست و پاڵنەرێك بێت، بەڵام بەڕێوەبەرایەتی زانکۆ وەڵامی داواکارییەکەی ئەو مامۆستایەیان نەدایەوە و بڕیاریاندا بە چاپکردنی بەشی تەحقیقەکەی کتێبی (المحصول) و بەشی لێکۆڵینەوەکەیان دامەوە و چاپیان نەکرد.

ئەمانەم هەمووی بۆیە باسکرد بۆ ئەوەی دیاردەیەك لە دیاردەکانی قەیرانی عەقڵی تاکی مسوڵمانی ئەمڕۆ روون بکەمەوە لە مەسەلەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ بابەتەکانی زانست و مەعریفە لە سەر (منطلق)ی توانجدان لەپەنهانیدا و گریمانە و پێشبینی نابەجێ و بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و گومانی ئامادەکراو و گورخی (مجازفة)کردن لە وەسفکردنی خەڵکی و تاقم و تایەفەکان بەپێی حەز و ئارەزووەکانی هەوا و نەفس، دەرکردنی حوکمی جیاواز جیاواز لەبارەیانەوە بەبێ ترس و خۆپاراستن، خەڵکی ئەو بنەما گرنگانەیان لەبیر کردووە کە ئیسلام ڕەوانەی کردوون و جەختی لەسەر کردوونەتەوە، خەڵکی هانداوە لەسەر ڕەچاوکردنیان لەبارەی مامەڵەی زانا و قوتابی و گوێگر و قسەکەر و بیسەرەوە، لەوانە ئەو یاسا زێڕینە کە داوا لە گێڕەرەوە (الراوي) دەکات کە بەڵگەیەکی پێبێت کە ڕاستی گێڕانەوەکەی بسەلمێنێ و داوا دەکات لە خاوەن شکات - هەر شکاتێك بێت- بەڵگە بهێنێت لەسەر ڕاستیی بەڵگەکەی: "ئەگەر گێڕەرەوەی، ئەوە ڕاستیەکە بسەلمێنە و ئەگەر شکاتکەری، ئەوە بەڵگە بهێنە"، لە پێش هەموو ئەم شتانەوە خوای گەورە دەفەرموێ: (وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً) (الإسراء:٣٦).

پەیمانگای جیهانیی فیکریی ئیسلامیی و پیاوەکانی و کاروبارەکانی تووشی ئەو جۆرە توانجانە بوونەتەوە کە شێخولئیسلام تووشی بۆتەوە لە تێنەگەیشتن لە مەبەستەکانیان و لاڕێ بوون لە تێگەیشتن لە چۆنیەتی بیرکردنەوەیان و پشتبەستن بە چەند پڕوپاگەندەیەکی ڕقئامێز و هەڵێنجانی هەڵە لە هەڵوێست دەربڕین لەبارەیانەوە، هەموو ئەوەی کە ئاواتی پێدەخوازین ئەوەیە کە مرۆڤی مسوڵمان عەقڵیەتی شوێنکەوتوویی کوێرانە تێپەڕێنێت بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەو سروشتە

بەڵگەویستیەی کە ئیسلام دایهێنا و دروستی کرد، مسوڵمان شتێك نەڵێت کە زانیاریی لە بارەیەوە نییە و شتێك نەگێڕێتەوە کە بەڵگە و شاهیدی پێویستی لەسەر ڕاستیی و دروستیی نییە بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەو گێڕانەوەیە، هەروەها نێچیرەکەی تاونەدا بەبێ بەڵگە و نیشانە و هیچ کام لەمانە وەرنەگرێ تەنها بەنیشانەی روون و بەڵگەی ئاشکرا نەبێت.

لەبەر ئەوە ئەم نامیلکەیە هەوڵی داوە کە پەیوەندیی نێوان فیکری شێخولئیسلام ئیبنوتەیمیە و ئیسلامبوونی زانستەکان روون بکاتەوە، ویستوویەتی سوور بێت لەسەر روونکردنەوەی ڕاستیی بۆچوونەکە و بەڵگەی بۆ بهێنێتەوە بەقەدەر پێویست ـ بە پشتیوانی خواـ، بە مەبەستی پشتڕاستکردنەوەی و روونکردنەوەی ڕاستییەکەی. داواکارین لە خوای گەورە کە سوودی لێوەربگیرێ و ڕێنمایی پێبکرێ، بێ نیاز نین لە ئامۆژگاریی ئامۆژگارییکاران و تێبینی خوێنەران، خوا پشتیوانی پیاوچاکانە و ڕێنموونییکەری کەسانێکە کە داوای ژیریی دەکەن و بەرەکەت دەخاتە نێو کاری بێنیازانەوە، ئەو بەڕاستی بیسەر و وەڵامدەرەوەیە.

**د. تەها جابر عەلوانی**

**سەرۆکی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی(*)**

**هیرندن، ڤێرجینیا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا**

**ذو الحجة/١٤١٤هـ**

**ئایار/١٩٩٤م**

(*) ئەوکاتە سەرۆکی پەیمانگای ناوبراو بوو، ئێستا دکتۆر عەبدولحەمید ئەبو سلێمان سەرۆکی پەیمانگایە.

# ئەم پیاوە و ڕێباز و بەرنامەکەی

ئەوانەی کە لە بارەی ژیانی کەسایەتییەکانەوە دەنووسن و باسی قۆناغەکانی ژیانیان دەکەن، یەکەم شت پرسیار لە چۆنیەتی پەیدابوونی ئەم ئینسانە و پەروەردەبوونی و خێزانی و چواردەوری و ئەو کەش و هەوایەی تیایدا گەورە بووە و ئەو کۆمەڵگا فراوانەی کە تیایدا ژیاوە و قۆناغە جیاجیاکانی ژیانی، دەکەن، نووسەر و زانایانی مسوڵمانی بواری زانستی ژیاننامەی (التراجم والطبقات)[1] واڕاهاتوون کە لەگەڵ ئەمانەدا مامۆستاکانی و پەروەردەکار و نووسراو و کتێبەکانی و سەرچاوەی فێربوون و دروستبوونی و ئەو سەرچاوانەی کە وەرگیراون لە نووسینەکانی ئەوەوە و چەندین باس و خواسی دیکەی خۆش و ناخۆش کە پەیوەستن بەو کەسەوە، باس بکەن.

شێخولئیسلام ئەحمەد تەقیەدین ئەبولعەباس ئیبن تەیمییە، لەدایکبووی ساڵی: (٦٦١هـ - ١٢٧٣م)ە و لە ساڵی (٧٢٨هـ - ١٣٢٨م) وەفاتی کردووە، زانایانی بواری ژیاننامەی (الترجمة) و نووسەرەکان لەبارەی ژیاننامەیەوە حەقی خۆیان پێداوە، زۆر کەس وا گومان دەبەن کە هیچ شتێك نەماوە لە باسی ژیانی ئیبنو تەیمیە و بەرهەمەکانی شایستەی باسکردن بێت، یان پێویست بە باسکردن بکات، چونکە نووسەران باسی ژیاننامە و کردارە جوان و ڕەوشتە بەرزەکانی و شێوەی و ئەو خێزانەی تیایدا لەدایك بووە و مامۆستا و پەروەردەکەرەکانی و هەوڵ و کۆششە زانستی و سیاسیی و فیکرییەکانی و شەڕەکانی کە ئەنجامی داون و نەیارەکانی و هەڵوێستیان بەرامبەری و لێبووردەیی و دنیانەویستیی و لەخوا ترسانەکەی و خۆ بەکەمزانینیەکەی و قوتابییەکانی و کتێبەکانی کە دایناون و ژن نەهێنانەکەی و هۆکاری پشت هەڵکرنی لە ژنهێنانی و چەندین بابەتی دیکە، کە پەیوەندیی بە ژیانی

---

[1] ئەم زانستە بریتییە لە زانستی باسکردنی ژیانی زانایان و ڕاوی فەرموودەکانی پێغەمبەر و کاتی لەدایکبوون و مردنیان و پلەی باوەڕپێکردنیان لە وەرگرتنی قسە و فەرموودەکاندا. وەرگێڕ

تایبەتی و گشتیی ئەوەوە هەیە، موسڵمان و ناموسڵمان لەم بارانەوە نووسیویانە [1]، چونکە بەڕاستی ئەو پیاوە کەسێکی مەوسوعەیی بووە، کە نوێنەرایەتی دیاردەیەك، یان قوتابخانەیەك دەکات، کە بۆ خۆی چەقەکەی بووە و لایەنەکانی لێکداوەتەوە.

ئەم قوتابخانەیە پەیڕەو و پرۆگرام و یاسای مەعریفی و وێنا و تێڕوانینی خۆی هەبووە سەبارەت بە زانست و عەقیدە و خوێندنەوە بۆ بابەتەکان و تازەگەریی و ئیجتهاد و سۆفیگەرێتی و سەلەفیەت و سیاسەت و دەسەڵاتداریی و ماڵ و ئابووریی و جیهاد و کۆششکردن و چاکسازیی و گۆڕانکاریی و فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگرییکردن لە خراپە و چەندین مەسەلەی دیکەی پەیوەست بە دنیا و دواڕۆژەوە.

ئەم قوتابخانەیە، یان ئەم دیاردەیە، کاتێك گەشەی کرد ئوممەتی ئیسلامیی لە حاڵەتی تێکشکان و گەڕانەوەدا بوو بۆ دواوە، بەڵکو لە حاڵەتێکی نزمی و تێکچووندا بوو لەسەر ئاستی دەوڵەتان و دەسەڵاتداراندا، لەسەر ئاستی فیکر و تێڕوانین و بیروباوەڕ و پەیوەندییەکان و هەڵسوکەوت و دامەزراوە وەقفی و دادوەرییەکان و خوێندنگا و لێپرسینەوە و هاوشێوەکانیان، ئوممەتی ئیسلامیی وەك ئەوە وابوو کە بووبێت بە چەند پارچە و تاقمی جیاجیا و نزیك لەیەکترەوە لە زەویدا، لەسەر هەریەك لەو پارچانە ئیمارەیەك و دەوڵەتێك هەبوو، بنەماڵەیەك، یان چەند بنەماڵەیەك، دەستی بەسەرداگرتبوو، یان کۆمەڵە خاوەندار بەندەیەك حوکمیان دەکرد، هەموو یەکێك لەو پارچانە کە پێیان دەوترا دەوڵەت، یان ئیمارەت، یان هەر شتێکی دیکە، شەکەت

---

١ زۆر کتێب لەبارەی ژیاننامەیەوە نووسراون (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، هەندێکی بەچاپ گەیەنراون و هەندێکی دیکەشیان هێشتا هەر دەستنووسن، لەو کتێبانە: (جلاء العينين) و (المناقب العلية) و (شيخ الإسلام ابن تيمية) دانانی (أبو الحسن الندوي) و (ابن تيمية) دانانی: موحەممەد ئەبو زهرە و (ابن تيمية) دانانی: هنری لاکوست.. چەندین کتێبی دیکە. هەروەها زۆر باسی ژیاننامەکەی کراوە لە تێز و نامە زانکۆییەکاندا، کە ئامادەکراون سەبارەت بە پاشماوە جۆراوجۆرەکانی لە: تەفسیر و بنەماکانی فیقهـ و عیلمی کەلام و ڕەوانبێژیی (البلاغة)... هتد. لە ساڵی ١٣٨٠هـ ـ١٩٦١م میهرەجانێکی فیقهی هەفتەیی سازدرا بە ناوی: "میهرەجانی ئیبنوتەیمیە"، تیایدا چەندین توێژینەوە پێشکەش کرا، کە باسی چەندین بواری ژیانی ئیبنوتەیمییەیان تێدا کرا.

بووبوون بە بڕینی خاچلەملەکان (الصليبيين) و دەستڕێژییکردنەکانیان، هەمیشە دەترسان لە هێرشەکانی تەتار و شەڕەکانیان.

## قەیرانی فیکریی

بەڕاستی قەیرانی فیکریی لە سەردەمی شێخولئیسلام ئیبن تەیمییەدا گەیشتبووە لوتکە، زۆر گەورە و زەبەلاح بوو، خانە شێرپەنجەییەکانی بڵاوبووبوونەوە، بە شێوەیەك سێبەرە ناحەزەکەی باڵی کێشابوو بەسەر لایەنەکانی تێگەیشتن و بیروباوەڕ و پەیڕەو و سەرچاوە و پەیوەندیی و مامەڵە و سیاسەت و ئابووریی و لایەنە ئاوەدانییە جیاجیاکانی وڵاتدا، هەروەها هەڵسوکەوت و ڕەوشت و شێوازەکانی دینداریی و تێگەیشتنی خەڵکی بەتەواوی بەرامبەر بە خودی ئایین گۆڕابوو، گۆڕانێکی وا کە گرنگترین لایەنە بنیاتنەرە وەزیفییەکەی گرتبووەوە و کاریگەرییەکەی تووشی لەرزۆکی کردبوو، تەنانەت بیدعە و داهێنراوەکان لە دیندا و لادانەکان لە ئایین بوو بووە هۆی سەرهەڵدانی زۆرێك لە شتی پێچەوانە و هەڵسوکەوتی ناڕێك و لاڕێ و نەشاز کە بەرگی ئایینیان لەبەر کرابوو.

لە سەردەمی یەکەمی ئیسلامەتیدا، گرنگترین پارێزەری فیکریی ئیسلامیی لە لادان و چەوتی، بنیاتنانی فیکر بوو لەسەر چەند بنەمایەکی بیروباوەڕی خوایی بەهێز و دامەزراو لەلایەن وەحی خواییەوە بە هەموو پایە و بەش و تایبەتمەندیی و هۆکارەکانی مانەوەیەوە، ئەو سەرچاوە خواییە پارێزراوە تاکە سەرچاوەی بیروباوەڕ و عەقیدە تەواوەکە بوو، تەنها هەر ئەوە بوو ئەم عەقیدەیە و ئەوەی لێی پەیدا بوو بوو لە تێڕوانین و ئەفکاری جیا دەکردەوە، لەو تێڕوانین و فیکرە فەلسەفییانەی کە زادەی بیری مرۆڤ بوون سەبارەت بە مەسەلەکانی حەقیقەتی خوایی و حەقیقەتی کەونی و

حەقیقەتی مرۆڤەکان [1]، هەروەها پەیوەندیی لە نێوان ئەم حەقیقەتانە هەڵێنجانی عەقڵییان دەکرد، هەروەها سرووش (وحي) و هەڵێنجانی عەقیدە لێی و دانەپاڵی عەقیدە تەنها بۆ لای ئەو، بوو بووە هۆی جیاکردنەوە و پاراستنی عەقیدەی پاك لە بیروباوەڕە بتپەرستانەییەکان کە هەست و خەیاڵ و ئەندێشە و وەهم و تێگەیشتنە چەوتەکانی مرۆڤ دروستی کردبوون، هەروەها چەند تایبەتمەندییەکی دیکەی پێبەخشیبوو، کە لە بیروباوەڕ و عەقیدەکانی دیکەدا نەبوون، لەوانە: داگرندەیی و گشتگیریی و سەقامگیریی و توانای وەڵامدانەوەی پرسیارە گەورەکان و پێشکەشکردنی هەندێك روونکردنەوە و دیاریکردنی پەیوەندیی نێوان خوا و بوونەوەر و مرۆڤ[2].

بەڕاستی عەقیدەی ئیسلامیی نوێنەرایەتی تاکە بیروباوەڕی خوایی پارێزوراو دەکات کە بە سەلامەتی ماوەتەوە، دڵ ئاو دەخواتەوە لەوەی کە ئەم بیروباوەڕە تەنها لە وەحی خوایی وەرگیراوە و لە شتی دیکە وەرنەگیراوە، بە پێچەوانەی بیروباوەڕی خاوەن کتێبە ئاسمانییەکانی دیکە، چونکە پشتیان بەستووە بە هەندێك سەرچاوەی دیکە بێجگە لە وەحی، تووشی چەندین لادان و شێواوی و ناڕێکی بوونەتەوە، حەقیقەتە خواییەکەیان لەدەست داوە، هەروەها بیروباوەڕە بەشەرییەکان وەحی خواییان نەکردووە بە سەرچاوە، هەندێکیان کە لە تێگەیشتنە فەلسەفییەکان هەڵێنجراون، تاکە سەرچاوەیان بیری مرۆڤەکانە، لەگەڵ ئەو هەموو سنووردارییی و کورت و کوێرییەی کە لە بیری مرۆڤەکاندا هەیە، ئەمانە هەندێکیان چەند تێگەیشتنێك بوون تێنەپەڕیون لە هەوڵەکانی مرۆڤایەتی کە نەیانتوانیوە و کورتیان هێناوە لەوەی بەتەواوی پێناسەی بوون (الوجود) و پەیوەندیی مرۆڤ پێیەوە بکەن، هەندێکی دیکەیشیان لە خەیاڵ و ئەندێشە بەشەرییە وشکەکانەوە پەیدا بوون.

[1] بڕوانە: (خصائص التصور الإسلامي: سید قطب)، چەند جارێك لە چاپ دراوە، لەوانە چاپی یەکگرتووی ئیسلامیی جیهانی بۆ ڕێکخراوە خوێندکارییەکان.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

بۆیە کاتێك عەقڵیەتی موسوڵمان دەستی کرد بە مامەڵەکردن لەگەڵ فەلسەفە لەم بوارانەدا ـ کە نەدەبوو لایەنی وەحی خوایی تێپەڕێنێت نە لە بابەتە سەرەکییەکان و نە لە بابەتە جوزئییەکاندا ـ دەرگاکانی خراپەکاریی و لادان و تێکەڵکردنی لە نێوان بابەتەکانی پەنهان و ئاشکرای لەسەر کرایەوە، بە شێوەیەك هەتا ئێستاش کاریگەرییە خراپ و زیانبەخشەکانی لە واقیعی ئیسلامییدا و لەسەر عەقڵی مسوڵمان و فیکر و ڕۆشنبیری ئیسلامیی هەتا ئەمڕۆ روون و ئاشکران[1].

## قەیرانی ڕۆشنبیریی

قەیرانی ڕۆشنبیرییش لە سەردەمی ئیبنو تەیمیەدا هاوشانی قەیرانی فیکریی هاوتەریب بوو لە ڕووخاندنی ڕاگر و هێز و کاریگەریی ئوممەتی ئیسلامیی، فەلسەفە بەتەواوی بڵاو بوو بووە، بە شێوەیەك کە بووبوو بە سەرچاوەیەك بۆ بنیاتنانی زۆرێك لە تێڕوانینەکانی عەقڵی تاکی موسڵمان، بەڵکو بووبوو بەسەرچاوەی بنیاتنانی هەندێك لە بیروباوەڕەکان لە دڵ و ویژدانی موسڵماناندا لە جێی ئایەتەکانی قورئان و سوننەتە موتەواتیرەکانی پێغەمبەر ﷺ کە تاکە سەرچاوەن بۆ بیروباوەڕ و عەقیدەی مرۆڤی موسڵمان، تەنانەت هەندێك لە ئایەتەکانی پەیوەست بە بیروباوەڕ و عەقیدە ملکەچ دەکران بۆ چەند لێکدانەوە و لادان ( التأویل)ێك لە مانای سەرەکیی بۆ لێکدانەوەی

---

[1] زۆرێك لە نووسەران لەبارەی کاریگەرییە سلبییەکانی وەرگێڕانی پەرتووك و نووسراوەکانی یۆنانی کۆن بۆ زمانی عەرەبی، نووسیوویانە، لەو کاریگەرییە خراپانە: پیادەکردنی ئەو جۆرە بیرکردنەوە فەلسەفییانەی کە لە بوارەکانی بیروباوەڕ و عەقیدەدا هەن، کە قورئان یەکلایی کردوونەتەوە، قسەی کۆتایی لەبارەیانەوە داوە، لە ناودارترین ئەو جۆرە نووسینانە کتێبەکەی ئیمامی غەزالی (تهافت الفلاسفة ـ زۆر بلێیی فەیلەسوفەکان) و ئەو بەشەی کە دکتۆر عەبدولحەمید ئەبوسولەیمان تەرخانی کردووە لەم بوارەدا بۆ ڕوونکردنەوەی کاریگەرییە سلبییەکانی لەسەر عەقڵی موسڵمان لە کتێبەکەیدا (أزمة عقل المسلم ـ قەیرانی عەقڵی موسڵمان)، هیرندن: چاپ: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی (١٩٩١م).

نزيك، يان دوور لە مانا سەرەكییەكە، بۆ ئەوەی بگونجێت لەگەڵ بنەما فەلسەفییەكان، ئەوەی دواتر ناسرا بە زانستی كەلام (علم الكلام) بەتەواوی لەسەر بنەماكانی فەلسەفە بنیاتنرا، دەتوانین بڵێین كە زانستی كەلام (علم الكلام) ئەگەر بۆ خۆی فەلسەفە نەبێت و لەسەر فەلسەفە بنیات نەنرابێت، ئەوە برا و هاوشانی فەلسەفەیە.

لە سەرەتادا خەڵكانێك گرنگییان بەم زانستە دا و چوونە ناو بابەتەكانییەوە، بۆ ئەوەی بەهۆیەوە پارێزگاریی لە بیروباوەڕ و بنەماكانی عەقیدەی ئیسلامیی بكەن، دژ بەو كەسانە بووەستنەوە كە ڕەخنە لە ئیسلام دەگرن و ڕەتی دەكەنەوە، وەك گاور و جولەكەكان و هاوەڵپەرستەكان، بۆ ئەوەی بەم زانستە بۆیان بسەلمێنن كە ئەم بیروباوەڕ و عەقیدە ئیسلامییە، ئەگەر بە دەقە ئیسلامییەكانیش نەسەلمێنرێ، ئەوە لە پێداویستییەكانی عەقڵە و بە عەقڵ دەسەلمێنرێ، لە سەرەتادا ئەوانەی خەریكی ئەم زانستە بوون، بەهانەكانیان بۆ زۆر بانگەشەكردن بۆ بەڵگە عەقڵیەكان و پشتبەستنی زۆر پێیان و زۆر بەكارهێنانیان و لادان (تأويل)كردن لە مانا دیار و سەرەكییەكانی دەقەكاندا، كاتێك كە عەقڵیان بەگومان دەبوو لە مانا سەرەكیی و دیارەكانیان و پشتبەستن بەو مانایانە، ئەوەبوو كە ئەوان ڕووی وتووێژیان لەگەڵ ئەو كەسانەدایە كە باوەڕیان بە قورئان و پێغەمبەری خوا ﷺ نییە و فەرموودەكانی ئەو بە بەڵگە دانانێن، بۆیە ناكرێ گفتوگۆ لەگەڵیان و بەڵگە هێنانەوە لەسەریان تەنها بە پشتبەستن بەو بەڵگانە نەبێ كە ئەوان باوەڕیان پێیەتی و دانی پێدادەنێن كە ئەویش "بەڵگە عەقڵییەكان"ن، هەتا ئەوكاتەی كە بە عەقڵیان موسڵمان دەبن و دڵ و دەروونیان نەرم دەبێت، پاشان دڵیان دادەمركێت و ئاو دەخواتەوە، ئەوكاتە ڕۆڵی بەڵگەكانی قورئانی پیرۆز و سوننەتەكانی پێغەمبەر ﷺ دێن، تا ئەم سنوورە گرنگییدان بە زانستی كەلام (علم الكلام) مەقبولە، بەڵام لە دوای ئەوەی كە ماوەیەك بەسەر ئەم بابەت و بەكارهێنانە عەقڵیی و فەلسەفیی و مەنتیقییانەدا تێپەڕیی، لەم سنوورەدا نەوەستا، بەڵكو بە خێرایی ئەم زانستە گوازرایەوە بۆ ناو بازنەی ئیسلام، تا ئەوەی بوو بە بەڵگە و وەسیلەی سەرانی تاقم و دەستە ئیسلامییەكان (الفرق

الإسلامية) بۆ دژایەتییکردنی یەکتر و سەلماندنی قسە و باسەکانیان پێی و وەڵامدانەوەی یەکدی، تەنها بە بەڵگە عەقڵییەکان و پشتگوێخستنی بەڵگە نەقڵییەکانیان و بە لاواز دانانیان، وەك لەمەودوا بۆمان روون دەبێتەوە.

## خوێندنەوەی بابەتییانە

زۆر بە ئاشکراتر ترسناکیی ئەم بابەتە ـ بابەتی ململانێی کەلامی ـ دەردەکەوێ، کاتێك هەست دەکەین ئەم گەل و ئوممەتە، ئوممەتی خوێندنەوەیە، بە خوێندنەوە دروست بووە و بۆچوون و بیروباوەڕەکانی بنیات ناوە، هەموو یاسا و پەیوەندیی و بنەما عەقڵی و دەروونییەکانی لەسەر خوێندنەوە دامەزراندووە، هەموو ئەمانە دەستی پێکردووە کاتێك خوای گەورە فەرمانی کرد بە خوێندنەوە (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) (العلق: ١)، بەڵکو ئەم ئوممەتە بەوە جیا دەکرێتەوە کە خاوەنی "کۆکەرەوە لەنێوان دوو خوێندنەوەکە ـ الجمع بين القرائتين"ە[1]، هەر لادانێك لەم خوێندنەوەیە بە

[1] پەیڕەوی " کۆکردنەوە لەنێوان دوو خوێندنەوە ـ الجمع بين القراءتين" مەبەست پێی خوێندنەوەی وەحی و خوێندنەوەی "بوون – الوجود"ە و تێگەیشتنی مرۆڤی خوێنەر لە هەریەکەیان بەوی دیکە، بەوپێیەی قورئانی پیرۆز هاوکێشەیەکی بابەتییە بۆ "بوون ـ الوجود" و بۆ کەون، واتە قورئان وتەی خوێنراوەی خوایە و کەون و بوونیش. وتەی دارێژراو و بڵاوکراوە و بینراوی خوایە، قورئان بە تێڕوانینێکی گشتیی بۆ هەموو دەقەکانی وەك یەك پارچەی یەکگرتوو دەبینین لە دووتوێی ئەو یەکپارچەییەدا پەیڕەوێکی تێر و تەواوی گرتۆتە خۆی، دەکرێ تێی بگەین و لێی هەڵبێنجین لە چوارچێوەی ئەو یەکپارچەییەدا، واتە خوێندنەوەی بابەتییانە بکەین بۆی بە سەیرکردنی دەقەکانی بەشێوەیەکی گشتیی بەیەکەوە، هەروەها کەون و بوونەوەریش لە دووتوێی یەکپارچەییە گشتییەکەیدا چەندین یاسا و ڕێسا و سوننەتی بۆ بوونەوەر و کەون گرتووەتە خۆی، کە مرۆڤایەتی ڕێنمایی دەکات بۆ جێنشینی لەسەر زەوی، ئەم جۆرە بیرکردنەوە و پەیڕەوە (الجمع بين القراءتين)، زانا "حارسی موحاسەبی (٢٣٤ھ کۆچی کردووە)" ئاماژە سەرەکییەکانی بە کورتی لە کتێبەکەیدا باس کردووە بە ناوی (العقل و فهم القرآن ـ عەقڵ و تێگەیشتن لە قورئان): بەیروت، چاپی (خانەی فیکر)، ساڵی (١٣٩١ھ -١٩٧١م)، پێشکەشکردن و وردبینی: حسين القوتلي)، بەڵام ئاماژەکانی

**پشتگوێخستنی هەردوو خوێندنەوەکە بێت، بەوەی پەناببرێتە بەر خوێندنەوەی دیکە، یاخود دەستگرتن بە یەك جۆر خوێندنەوە، ئەوە بێگومان سەر دەکێشی بۆ لەناوچوون و ڕوودانی کارەسات.**

**کاتێك تێڕوانینی ئیسلامیی دەڕوێت و گەشە دەکات بەهۆی خوێندنەوەوە - بەتایبەت عەقیدە و بیروباوەڕی ئیسلامیی - بۆ ئەوەی دیدی ئیسلامیی ڕێکبخات، ئەگەر تێڕوانینی ئیسلامیی و عەقیدەی ئیسلامیی بنیات بنرێ لەسەر گوتەن (منطق)ێکی دیکە جگە لە گوتەن (منطق)ی کۆکردنەوە لەنێوان دوو خوێندنەوە (الجمع بين القراءتين)کەدا، ئەوە ئەنجامەکەی سەرگەردانی و لادان دەبێت لە پەیڕەوی**

---

کتێبەکە پەیوەستن بەو سەقفە مەعریفیەی کە لەو کاتەدا باو بووە و بەو حاڵەتە فیکرییە گشتییەی ئەو کاتە، پاشان ئیمامی فەخرەدینی رازی فراوانتر باسی لەو بابەتە کرد، تەفسیرە گەورەکەی (مفاتح الغیب)ی لەسەر ڕۆشنایی ئەم پەیڕەوە و لە سنووری بیروباوەڕەکانیدا لە سەردەمی خۆیدا بینا کرد، هەروەها هەندێك ئاماژەی هاتووە لە (الفتوحات المكية)ی زانا ابن العربی، زۆربەی ئەوانەی کاریگەریی ئیمام فەخرەدینی رازییان بەسەرەوەیە بەرێڕەوی ئەودا چوون و بۆچوونی ئەویان هەڵگرتووە لەم ڕووەوە، هەروەها ئاماژەی جیاجیا هاتووە لە تێڕوانینی نزیك لەم پەیڕەوەوە لەلای زۆرێك لە ڕاڤەکارەکان (المفسرين) و لە ناودارترین ئەو کەسانەی جارێکی دیکە ئەم پەیڕەوەیان بنیاتناوەتەوە و تاوتوێیان کردووە لە زانایانی سەردەم، مامۆستا "محمد أبو القاسم حاج حمد" کە شەرحی کردووە و ڕوونی کردووەتەوە و زۆرێك لە بیرۆکەی گرنگی لەسەر بنیات ناوە لە کتێبەکەیدا بەناوی (العالمية الإسلامية الثانية)، لەو دوو لێکۆڵینەوەیەی کە ئامادەی کردوون بۆ بڵاوکردنەوە (منهجية القرآن المعرفية ـ پەیڕەویەتی قورئان لە ڕووی مەعریفیەوە) و (الأزمة الفكرية في الواقع العربي الراهن ـ قەیرانی هزریی لە واقعی ئێستای عەرەبدا).

من لە زنجیرە دەرسەکانی (الحسنية الرمضانية) لێکۆڵینەوەیەکی کورتم ئامادەکرد لە ساڵی (١٩٩٣م) لە وڵاتی مەغریب لەبارەی ئەم پەیڕەوەوە (الجمع بين القرآئتين) و ویستم زیاتر تیشکی بخەمەمە سەر، ئەم بابەتە تا ئێستاش پێویستی بە لێکۆڵینەوە و قووڵبوونەوە و دەوڵەمەندیی زیاترە لەلایەن زانایانەوە، ئەوانەی خاوەنی تایبەتمەندی جیاجیان بۆ ئەوەی ئەم پەیڕەوە زیاتر خەڵك لێی تێبگات و بڵاوبێتەوە و کاریگەریی هەبێت لە تێگەیشتنی بوارە جیاجیاکانی قورئان و بنیاتنانی زانستە هاوچەرخەکانی، پرۆسەی "اسلامية المعرفة ـ ئیسلامێتی زانست" و بنیاتنانی تێڕوانینی شارستانێتی ئیسلامیی لە ئاستی ئەمڕۆیدا لەسەر ئەم بنەما توندوتۆڵە ڕاوەستاوە.

هیدایەت و دەرچوون دەبێت لە ڕێگای ڕێك و ڕەوان، عەقیدە تواناکانی خۆی و کاریگەریی و پاڵنەرە ژیاریی و شوێن پێیە ئیجابییەکانی خۆی لەسەر لایەنەکانی هزر و چالاکییە مرۆڤییەکان لەدەست دەدات، بەڵکو ڕەنگە بگۆڕێت بۆ کاریگەرییەکی سلبی لە ژیانی مرۆڤ لە سەر هەموو ئاستە جیاجیاکانیدا.

## عەقیدە و سەرچاوەکانی

قورئانی پیرۆز کاتێك هاتە خوارەوە بە پایەکانی ئیمان و بنەماکانی عەقیدەوە، پاشماوەیەکی زۆری بیروباوەڕ و بۆچوونی گومڕا و سەرلێشێوێنەر لە جیهاندا لە ئارادا بوون، زۆرێك لە فەلسەفە و ئەفسانە و خورافیاتی بڵاو هەبوون، کە چالاکیی مرۆڤیان پەکخستبوو، ژیانی دونیا و دواڕۆژیان تێکدابوو، وایان لە مرۆڤایەتیی کردبوو دەستەوەستان بوو بوو، لە هەندێك لە پێکهاتەکانی کەون دەترسا و ڕووی تێدەکرد و دەیپەرست، کە لە ڕاستیدا ئەو دروستکراوانە بۆ خزمەتی ئەو فەراهەم هێنرابوون و لەژێر دەستی ئەودا بوون، بۆیە عەقیدەی یەك خواپەرستی بەو بەرزێتی و ئاسانی و سادەییەی خۆیەوە، مرۆڤێتی و مرۆڤ دۆستی بۆ مرۆڤ گێڕایەوە و جێگە و پێگەی لە گەردووندا بەرز کردەوە، ئەو هەموو گۆڕانکاریی ئاوەدانیی و بنیاتنان و نۆژەنکردنەوەیەی هێنایە کایەوە و خەڵکی ڕزگار کرد لە تاریکییەوە بۆ ڕووناکی، لە ستەمەوە بۆ دادپەروەریی، لە پەرستنی ئەو شتانەی خوا بۆ مرۆڤی فەراهەم هێنابوون و لە پەرستنی مرۆڤ بۆ پەرستنی خوای تاك و تەنها، لە ستەمی ئایینەکانی دیکە بۆ دادپەروەری ئیسلام، بەڵام ئەوەی کە ـ دوای ئەوە ـ ناسرا بە زانستی کەلام (علم الكلام)، سنووری هەوڵەکانی خۆی بەزاند بۆ بنیاتنانی عەقیدە و لایدا لە شێواز و پەیڕەوی قورئانی پیرۆز، کە تاکە سەرچاوەیە بۆ هەڵێنجانی بابەتەکانی عەقیدە و بیروباوەڕ، دەستی کرد بە پێشکەشکردنی بابەتەکانی عەقیدە و پایەکانی لە چەند قاڵبێکی فەلسەفیی لاهوتی و عەقڵێ زاڵی سارد و سڕی بێگیان.

تەنانەت لەلای هەندێك لە زانایانی کەلام ئەم مەسەلەیە لە خواستنی هەندێك زاراوەی فەلسەفی یۆنانیدا نەوەستا لە بەکارهێنانەکانیاندا وەك زاراوەکانی (الجوهر والعرض والجسم والجوهر الفرد والواجب العقلي والجائز العقلي والمستحيل العقلي والهيؤلى والعلة والطبيعة..)، چەندین زاراوەی دیکە، بەڵکو هاتن ئەم زاراوانە و گفتوگۆ بێ سوود و گومڕاکەر و مانا پڕوپووچانەیان بەکارهێنا لە بابەتەکانی پەیوەست بە بنیاتنەر (الخالق) و جیهان و مرۆڤ و پێغەمبەرایەتی و پەنهان (غیب) و..هتد، کە قورئان قسەی یەکلاکەرەوەی خۆی وتووە لەبارەیانەوە[1].

تەنانەت هەندێکیان ڕۆچوون و سنووریان بەزاند بەوەی کە دەیانویست بەڵگە بیستراوەکان (الأدلة السمعية[2]) بەڵگە قورئانییەکان بن، یان فەرموودەکانی پێغەمبەر بە لاواز دابنێن لە بابەتەکانی عەقیدەدا، بەڵگە عەقڵییەکانیان پەسەند دەکرد و پاساویان دەدا بەسەر ئەو بەڵگانەدا، لەوانە ئیمامی رازی (خوا لێی خۆش بێت) ئەم کارە بە باش دەزانێت، کاتێك دەڵێت: "الأدلة السمعية لا تفيد اليقين أو القطع" واتە: بەڵگە بیستراوەکان دڵنیایی تەواویی ناگەیەنن، یاخود بێگومانیی ناگەیەنن. لەسەر ئەم بابەتە گفتوگۆیەکی کردووە لە کتێبەکەیدا بەناوی (المحصول في علم أصول الفقه)

---

[1] بەشێك لە سۆز و میهرەبانیی خوای گەورە بەسەر بەندەکانیەوە ئەوەیە کە هەموو ئەو بابەتە عەقیدییانە ـ کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووین باوەڕمان پێی هەبێت ـ قورئان یەکلایی کردوونەتەوە، هیچ بابەتێکی پەیوەست بە عەقیدە نییە لەو بابەتانەی ئەگەر مرۆڤ ئیمانی پێ نەبێت و ڕەتی بکاتەوە، کافر دەبێ؟، کە لە قورئاندا باس نەکرابێت، جا ئەو بابەتە عەقیدەییانە پەیوەست بن بە یەکتاپەرستی لە خاوەنداریتی (الربوبية)ی خوای گەورە، یان یەکتاپەرستی خوای گەورە لە پەرستندا (الألوهية)، یان (یەکتاپەرستی لە ناو و سیفەتە جوانەکانی خوای گەورە)، یان ئەو بابەتانەی پەیوەستن بە پێغەمبەرێتی و پێغەمبەران، یان کتێبە ئاسمانییە پێشووەکان، یان جیهانی پەنهان (غیب)، یان ڕۆژی دوایی و قەزا و قەدەر، ئەوەی لە قورئاندا نەهاتووە و بەڵکو لە فەرموودە یەکگێڕەرەوە (آحاد)کاندا هاتووە، ئینکارییکردن و قەبوڵ نەکردنی مرۆڤ کافر ناکات، تەنانەت لەلای ئەوانەش کە ئەو فەرموودانە قەبوڵ دەکەن لە بابەتەکانی عەقیدەدا ئەگەر تەنها ئەو فەرموودانە بەڵگە بن لەسەر ئەو مەسەلە عەقیدەییە.

[2] مەبەست بە بەڵگە بیستراوەکان (الأدلة السمعية) قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرە ﷺ. وەرگێڕ

**دەفەرموێ: "بابەتی سێیەم: سەبارەت بەوەی ئایا بەڵگە هێنانەوە بە وتەکانی شارع سوودی دڵنیایی تەواو دەگەیەنێ، یان نا؟، پاش تاووتوێکردن (خوا لێی خۆش بێت) بڕیار دەدات کە بەڵگە وتراوەکان (الأدلة السمعية) لەسەر چەند پێشەکییەکی گوماناوی بنیاتنراون هەرچیش لەسەر پێشەکی گومان بنیات بنرێت، ئەوە بۆ خۆی گوماناوی (ظني)یە، کەواتە بەڵگەهێنانەوە بە وتەکان (خطاب)ی شارع دڵنیایی تەواو ناگەیەنێت"[1].**

**ئەم بانگەشەیەی دووبارەکردۆتەوە لە کتێبە ناسراوە کەلامییەکەی بەناوی (نهاية العقول في دراية الأصول) و دەڵێت: "بەڵگەهێنانەوە لە بابەتە بنەماییەکان (واتە عەقیدەییەکان)دا بە بەڵگە بیستراوەکان (الأدلة السمعية) نابێت بە هیچ جۆرێك، چونکە بەڵگە هێنانەوە پێیان ڕاگیراون لەسەر چەند پێشەکییەکی گوماناوی (الظنية) و لەسەر پێچەوانە نەبوونیان لەگەڵ بەڵگە عەقڵییەکان[2][3].**

**پێش ئەم بۆچوون و وتانەی ئیمام فەخرەدینی رازی، چەند بۆچوون و وتەی هاوشێوە هەبوون سەبارەت بە بەکەم زانینی بەڵگە بیستراو و نەقڵکراوەکان (الأدلة السمعية) و پێشخستنی ڕا و بۆچوونی زانایان لەسەر ئەو بەڵگانە پەنا بەخوا، لەوانە:**

---

[1] بڕوانە کتێبی: "المحصول في علم أصول الفقه (١/٥٤٧)"، دانراوی ئیمام فەخرەدینی ڕازی، بە وردبینی و لێکۆڵینەوەی خۆمان (نووسەر)، ریاز، چاپی: زانکۆی ئیمام موحەممەدی کوڕی سعودی، ئیسلامیی، ساڵی: (١٣٩٩هـ - ١٩٧٩م). مەبەستی لە گومان تیایاندا ئەوەیە کە گومان هەیە لە تەواوی گەیشتنیان پێمان، یان ڕاڤەکردنەکانیان.

[2] مەبەست لەم مەسەلەیە ئەوەیە کە ئەهلی کەلام دەڵێن: بەڵگەکانی قورئان و سوننەت لە بابەتە عەقیدەییەکاندا وەرناگیرێن، چونکە ئەم بەڵگانە هەندێك گومانیان تێدا ماوە بەوەی کە فەرموودەکانی پێغەمبەر کەسانیك گێڕاویانەتەوە کە دەکرێ هەڵە، یان درۆیان کردبێت، بابەتە عەقیدەییەکانیش نابێت لەسەر گومان بنیات بنرێن، ئەو بەڵگانە هەندێك جار لەگەڵ عەقڵ و بەڵگە عەقڵییەکان ناگونجێن، هەروەها کەسە نەیارەکانی ئیسلام ـ بەتایبەت فەیلەسوفەکان باوەڕیان بە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر نییە، دەبێت ئێمە بەڵگەگەلێکیان بۆ بێنینەوە کە بەڵگەی عەقڵیی بن بۆ ئەوەی دەمکوتیان بکەین. (وەرگێڕ)

[3] بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

وتەی زانا شێخ ئەبوحەسەن عوبەیدوڵڵا کەرخی حەنەفی (٣٤٠ك کۆچی کردووە) لە کتێبی (الأصول)ەکەیدا دەڵێت: (ئەصل وایە هەر ئایەتێك کە پێچەوانە بوەستێتەوە لەگەڵ ڕا و بۆچوونی زانایانی مەزهەبی ئێمە، ئەوە مەنسوخە و کاری پێناکرێ، یان ڕایەکی دیکە کە بە بەڵگەیەکی دیکە چەسپاوە پەسەند دەکەین و پاساوی دەدەین بەسەر ناوەڕۆکی ئەم دەقەدا، باشتر وایە کە ئەم دەقە کە پێچەوانەیە لەگەڵ بۆچوونی زانایانماندا لێکدانەوەیەکی دیکەی بۆ بکەین لە چوارچێوەی ماناکانیدا، واتە (تأویل)ێکی گونجاوی بۆ بکەین)[1].

پاشان هەر هەمان زانا بنەمایەکی دیکە باس دەکات و دەڵێت: "ئەصل وایە هەر فەرموودەیەکی پێغەمبەر پێچەوانەی قسەی زانایانی مەزهەبی ئێمە هاتبێت ئەوە، یان مەنسوخە، یان فەرموودەی دیکە هەیە پێچەوانەی دەوەستێتەوە، پاشان ئیش بە هیچیان ناکەین و پەنا دەبەینە بەر بەڵگەیەکی دیکە، یان ڕا و فەرموودەیەکی دیکە پەسەند دەکەین و پاساوی دەدەین بەسەر ئەم فەرموودەیەدا بەپێی ئەو میکانیزمانەی زانایانمان پشتی پێ دەبەستن لە جۆرەکانی تەرجیحدان و پاساودانەوە، یان دەیگونجێنین لەگەڵ ڕای زانایانماندا، ئەمانە دەکەین بەپێی بوونی بەڵگە لەسەر ڕاکەی زانایانی خۆمان ـ واتە کە بەڵگەمان هەبێت ـ"[2].

ئا بەم شێوەیە بەڵگە بیستراوەکان (الأدلة السمعية) قورئان بوایە، یان فەرموودەی پێغەمبەر، کرابوون بە بەڵگەی ناسەرەکیی و نێوەند، تەنانەت لە بابەتەکانی عەقیدەشدا و کارپێکردنیان ڕاوەستابوون لەسەر پێچەوانە نەبوون و دژ نەوەستانەوەیان لەگەڵ بەڵگە عەقڵییەکان!!.

ئەم تێپەڕین و توندڕەوییە لە پشتبەستن بە عەقڵ و بەڵگەکانی و پێشخستنی لەسەر بەڵگە بیستراوەکان (الأدلة السمعية) تەنانەت لە بواری عەقیدەشدا، دژایەتی کرا

---

[1] بڕوانە کتێبی: (أصول الكرخي) چاپکراو لەگەڵ کتێبی (تأسيس النظر): خاوەنی: أبو زيد الدبوسي، چاپی قاهیرە (ل: ٨٤-٨٥).

[2] سەرچاوەی پێشوو.

**به له سنوور دەرچوون و توندییەکی پێچەوانە، کە وای کردبوو لە هەندێك کە هەموو ئەو دەقانە وەربگرن کە هاتوون لە بابەتەکانی پایەکانی عەقیدە و بەشەکانی و ڕاگرەکانی، جا ئەو دەقە فەرموودەی یەکگێڕڕاوە (آحاد) بایە، یان مەشهور، یان موتەواتر، یان ڕاست (صحیح) بوایە، یان باش (حسن)، کە بووە هۆی بارگرانکردنی بەشەکانی بیروباوەڕ بە کۆمەڵێك بیروباوەڕی خاوەن کتێبەکانی دیکە (أهل الکتاب)، هەندێك بیروباوەڕی دیکە کە پێچەوانە دەوەستایەوە لەگەڵ دەقە ڕاشکاوەکانی (الصریح) قورئان لە شوبهاندنی خوا بە دروستکراوەکانی و قەرارداني جسم بۆ خوا و پەکخستنی سیفەتەکانی خوای گەورە و چەندین شتی دیکە.**

**ئەگەر دوورتر بڕۆین دەبینین لە بەرامبەردا هەندێك خەڵکی ڕۆچووی ئەهلی تەصەوف قسەیان دەکرد لە بابەتەکانی عەقیدە لە ڕوانگەی یەکپارچەیی بوون (وحدة الوجود)[1].**

---

[1] هەندێك لە گەورە پیاوانی ئەهلی تەصەوف مەشهورن بەوەی کە هەڵگری بیروباوەڕی (وحده الوجود)ن، لەوانە وەك (ابن عربی) لە کتێبەکەیدا (الفتوحات) و (الفصوص)، (ابن الفارض) لە (التائیة الکبری) و حەلاج لە قسە هەڵبەت و پەڵیتەکانیدا و.. غەیری ئەمانەش.

پەیڕەوی (وحدة الوجود) هیچ ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی لەبارەوە نییە، نە بە ڕاستەوخۆ، نە بە ئاماژە، هیچ فەرموودەیەکی پێغەمبەری خواشی لەسەر نییە و لە پەیڕەو و فەرموودەکانی پێشین (سلف)ی ئوممەت و گەورەپیاوانیاندا هیچ شتێکی لەبارەوە نەهاتووە، ئەوانەی ڕەواجیان داوە بەم پەیڕەوە لەوانەی باسمان کردن و غەیری ئەوان، ئەم بۆچوونەیان لە بەراهیمەکانی هندەوە وەرگرتووە کە مەشهوورن بە (الحلولیین والإتحادیین)، ئەوانەی عەقڵ و دڵەکانیان نەیتوانیوە کە یەکتاپەرستی بێ خشڵ و خاڵ قبوڵ بکات لە پەرستنی خوای گەورەدا، بۆیە هەندێکیان وا گومانیان بردووە کە خوا و بوونەوەرەکانی یەك شتن، هەروەها ئەم پەیڕەوە هەندێك لە فەیلەسوفە یۆنانییەکانیش باوەڕیان پێیبووە، بەتایبەت ڕەواقییەکان، لە ئیبن عەرەبیشەوە گێڕدراوەتەوە کە باوەڕی وابووە، بەڵگەش لەسەر ئەوە دەڵێت: "ئەگەر مرۆڤ گەیشتە حاڵەتی فەنابوون ئەوە لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا دەبێت بە یەك" و لە شیعرەکەیدا دەڵێت:

روحه روحي وروحي روحه     إن يشأ شئت و وإن شئت يشأ

واتە: ڕۆحی ئەو ڕۆحی منە و ڕۆحی من ڕۆحی ئەوە، ئەگەر بڕیار بدات بۆ کارێك منیش بڕیار دەدەم، ئەگەر منیش بڕیارمدا ئەوە ئەویش بڕیار دەدات، مەبەستی خوای گەورەیە). الفتوحات المکیه (٣٧٣/٤)، هەروەها

**كه پاشماوەی تێڕوانینه بیروباوەڕە شیركی و بتپەرستیەكانه و پاشماوەی ئەو تێڕوانینه نارێك و شێواوە حلولی و ئیتحادیانەیە بۆ مرۆڤ، ئەو تێڕوانینه پەشێو و نارێكەیە بۆ بوون و ئەو ڕایە ناتەواوە بۆ ژیان و كردەوەكانی مرۆڤ و شتەكانی دیكەیە، چۆن بیروباوەڕێك ئەم هەموو پشێوی و نارێكی و كەكموكورتییانەی ببێ دەتوانێت بیر و هزری تەواو و ڕێك بێنێتە كایەوە، یاخود تێڕوانینێكی تەواو بدات بە مرۆڤ و هانی بدات بۆ ئەنجامدانی هەڵسوكەوتی شارستانیی؟!**

---

بڕوانە (٣/٥٣٥)".

هەروەها قسە مەشهورەكەی كە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| لقد كنت قبل اليوم أنكر صاحبي | إذا لم يكن ديني إلى دينه داني |
| لقد صار قلبي قابلا كل صورة | فمرعى لغزلان و دير لرهبان |
| و بيت لأوثان و كعبة طائف | وألواح توراة و مصحف قرآن |
| أدين بدين الحب أنى توجهت ركائبه | فالحب ديني وإيماني |

نشأة الفكر الفلسفي (٣/٣١).

واتە: من پێش ئەمڕۆ دژایەتی بوونی هاوڕێكەمم دەكرد، ئەگەر دینەكەم نزیك نەبوایە لە دینی ئەوەوە، بەڵام دڵم وایلێهات كە هەموو وێنایەك قەبوڵ بكات، بۆتە شوێنی لەوەڕاندنی ئاسكەكان و كڵێسای راهیبە مەسیحیەكان و شوێن و ماڵی بتەكان و كەعبەی تەوافكەرەكان، بۆتە ئەو لەوحانەی تەوراتیان تێدا نووسراوەتەوە و موصحەفی قورئان، من لەسەر دینی خۆشەویستییم و ڕووم كردۆتە كاروانەكانی خۆشەویستی، خۆشەویستی دین و ئیمانمە.

زۆریك لە زانایانی موسڵمانان هەستاون بە رەتكردنەوە و وەڵامدانەوەی ئەم پەیڕەوە فاسدە.. خاوەنی كتێبی (كشف الظنون) باسی زۆرێك لەو كتێب و نووسراوانەی كردووە كە نووسراون لە بارەی ڕوونكردنەوەی خراپی و پڕوپووچی ئەم پەیڕەوە و ئاشكراكردنی كاریگەرییە خراپەكانی لەلایەن زانایانی كۆن و تازەوە، لەنێو ئەو زانایانەی ئەهلی حەدیس كە وەڵامی ئەم پەیڕەوەی داوەتەوە و لە بارەی ترسناكییەكەیەوە نووسیویەتی (شیخ أحمد السرهندي و شاه ولي الله الدهلوي)، پاشان شێخ جەمالەددینی ئەفغانی و شێخ موحەممەد عەبدە و چەندین زانای دیكە.

هەندێك لە فەیلەسوفە غەربییەكانی نیمچەتازە هەڵگری ئەم پەیڕەوە بوون و ڕەواجی زۆریان بۆ داوە بە شێوەیەك لە شێوەكان، لەوانە: سپینۆزا، هیگڵ، دڵباخ، دیدوار.. بێجگە لەوان. بگەڕێرەوە سەر كتێبی: المعجم الفلسفي (٥٦٩- ٥٧٠)، و موسوعة الفلسفة: عبدالرحمن البدوي (٢/ ٦٢٤-٦٢٥).

## ڕاجیایی و دابەشبوونی زانایان سەبارەت بەزانستی کەلام

کتێبخانەی ئیسلامیی لە سەردەمی ئیبنو تەیمیەدا پڕ بوو لە کتێب و لێکۆڵینەوە و کتێبی مەتن و ڕاڤە و تێبینی و حاشیە.. کە ڕاڤەی بیروباوەڕ و عەقیدەی ئیسلامییان دەکرد بە شێوە کەلامییەکەی، هەموو ئەو بابەتانەیان دەگرتەخۆ کە بەم شێوە کەلامییە بە عەقیدە دادەنرا و خەڵکی بووبوون بە چەند بەش و تاقمێکەوە سەبارەت بەم ڕێگە کەلامییانە و پەیڕەوە فەلسەفییانە، کە دەکرێ لە دوو تاقمی سەرەکییدا ڕێك بخرێن:

**یەکەم:** ئەو تاقمەی کە هێرشیان دەکردە سەر ئەم زانستە و ڕقیان لێدەبووەوە و بە یەکێك لەو زانستە زیانبەخشانەیان دەزانی کە مرۆڤ ناگەیەنێتە ئیمان، خەڵك ڕزگار ناکات لە کوفر، بەڵکو لایان وابوو کە ئەمە زانستێکە ڕاوەستاوە لەسەر دەمەدەمێیەکی بێ ئەنجام و ئەو شێوازە فەلسەفیی و ڕێگە مەنتیقییانەی کە لە زانستی زانایانی پێش ئیسلامەوە هێنراوەتە ناو موسڵمانانەوە، هەموو ئەمانە زانست و هونەرێکن کە نادرێنە پاڵ گەلانی موسڵمان و هی ئەوان نەبوون، بەڵکو نامۆن بە موسڵمانان و لە دەرەوە بۆیان هاتووە، بۆیە ئەم تاقمە ڕایان وابوو کە دەبێت موسڵمان دوور بکەوێتەوە لە خوێندن و لێکۆڵینەوەی عیلمی کەلام، یان گرنگی پێبدا تەنها بۆ ئەوەی کە شارەزایی تێدا پەیدا بکات لەبەر وەڵامدانەوەی هەڵگر و پەیڕەوەکانی و ئەوانەی ڕەواجی پێدەدەن، دەتوانین بڵێین کە شێخولئیسلام ئیبنوتەیمیە و قوتابخانەکەی لەم تاقمە ئەژمار دەکرێن، لەگەڵ کەمێك شلی لەم بارەیەوە.

**تاقمی دووەم:** ئەو تاقمەن کە ئەم زانستەیان هەڵگرتبوو و پشکدارییان هەبوو لە بابەتەکانیدا و ئەم زانستەیان بە بەرێزترین زانست دادەنا و فێرکردن و فێربوونیان بە واجب دەزانی بۆ پاراستنی عەقیدەی ئیسلامیی و دیفاعکردن لێی.

بۆ زانینی بەڵگەکانی ئەم تاقمە دەکرێ سەیری زۆرێك لە کتێبەکانی فەخری رازی بکەین، بەتایبەت لە پێشەکی کتێبی (نهاية العقول)، لەوێدا بە درێژی باسی لەم بابەتە

کردووه، هەروەها لە (التفسیر الکبیر)دا کاتێ کە لێکدانەوە دەکات بۆ ئایەتی: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ) (البقرة: ٢١) واتە: ئەی خەڵکینە ئەو خوایە بپەرستن کە ئێوە و ئەوانەی پێش ئێوەی دروست کردووە. لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتەدا روونی کردۆتەوە کە زانستی کەلام بەرێزترین زانستە، فێربوونی واجبە و وەڵامی ئەوانەی داوەتەوە کە دەڵێن زانستێکی داهێنراوە و لە زانستی میللەتی موسڵمانان نییە، یاخود لەو زانستانەیە کە دەبێ پشت بکرێتە فێربوونی و خەڵك فێری نەبێت[1].

## عەقیدە وەك بنەمایەکی فیکریی

بەڕاستی ئەو دامەزراوە عەقیدیەی کە قورئانی پیرۆز خشت بەخشت دایمەزراندووە و گرنگی داوە بە هەموو بەشەکانی و یەکتاپەرستیی کردووە بە بنەما و سەرگە بۆی، بۆیە ئەو هەموو گرنگیەی پێداوە بۆ ئەوەی ئەم عەقیدە و بیروباوەڕە بە روونیی و بێگەردیی و خاوێنی و ئەو بەڵگە سەلمێنراوانەی کە لێیەوە پەیدا دەبن و ئەو توانا دڵنیاکەرەی لەسەر کردنەوەی "گرێ فەلسەفییە گەورەکان"، ئەو وەڵامدانەوانەی کە ناسران بە "الأسئلة النهائية ـ پرسیارگەلە کۆتاییەکان"[2]، ئەمە هەمووی لەبەر ئەوەیە کە عەقیدە و بیروباوەڕ ببێتە بنەمایەکی فیکریی لێوەیەوە دەست بە جوڵە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای ئەو، بە هۆیەوە هەموو هزر و بیروبۆچوونەکان و حوکم و بەها و ترازوی مرۆڤی مسوڵمان ڕێکببنەوە، بە هۆیەوە عەقڵیەتی مرۆڤی مسوڵمان و هەموو پێکهاتەکانی دیکەی لە زانیاریی و زانست و هونەر و رۆشنبیریی و شارستانی دروست

---

[1] بگەڕێرەوە سەر کتێبی: (المطالب العالیة) (١١٣/٩ و دواتر)، بیروت: (دار الکتاب العربي)، (١٩٨٧م).

[2] پرسیارگەلە گەورەکان، یان گشتگیرەکان، بەو پرسیارانە دەوترێت کە لە بارەی مرۆڤ و بوون و ڕاستییەکانی هەردووکیانەوە دەوروژێنرێن و لەبارەی ئەو شتانەی پەیوەندیی پێیانەوە هەیە کە لە ژێر ڕۆشنایی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەدا نوێنەرایەتی نموونە مەعریفیەکانی ڕۆشنبیریی میللەتە جیاجاکان دەکەن.

ببێت، چونکە پێویستە ڕەنگدانەوە و کاریگەرییەکانی ئەم عەقیدەیە دەربکەوێت لەسەر ئەو هونەر و ڕەوشت و بەها و زەوق و ژدانانەی کە کاریگەریی دەکەنە سەر "نەفسیەتی مرۆڤی مسوڵمان"، چونکە عەقیدە لە تێڕوانینی ئیسلامییەوە بریتییە لە پێوانەی هەڵسەنگاندنی هەموو بنەماکانی "کەسایەتی موسڵمان"، لە ڕووی عەقڵی و نەفسییەوە، ڕەنگدانەوەکانی لەسەر ئاوەدانیی و زانست و ئەدەب نابێت کەمتر بێت لە ڕەنگدانەوەی لەسەر خواپەرستیی باڵەخانەکانی، کەواتە ئەو بنەمایەیە کە دەبێت بەتەواوی سەلامەت بێت لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ ئەوەی بنیاتنانی عەقڵیی و نەفسیی مرۆڤ و گەلی موسڵمانان سەلامەت بێت.

عەقیدە تێڕوانینی گشتیی و گشتگیر بۆ مرۆڤ و کەون پێشکەش بە ئینسان دەکات، پەیوەندیی هەردووکیان بە خوای بنیاتنەری ژیان و مرۆڤ و گەردوونەوە دیاریی دەکات، پەیوەندیی کەون و ژیان بە مرۆڤ و ڕۆڵی مرۆڤ لەم ژیانە و لە دوای ئەم ژیانەش روون دەکاتەوە، بۆیە بەهۆیەوە گرێ گەورەکان دەکرێنەوە و پرسیارە کۆتاییەکان وەڵام دەدرێنەوە و کۆمەڵێك بنەمای بەڵگەنەویست بۆ مرۆڤ دروست دەبن، کە دەکرێ بکرێنە زەمینەیەکی گونجاو و مەبەست بۆ بنیاتنانی پرۆگرامەکانی بەڵگە و هۆکارهێنانەوە (التعليل)، شیکردنەوە و قیاسکردن و ئاشکراکردن و رەخنەگرتنی زانستیی و هەموو ئەو شتانەی دیکە کە بنیاتنانی مەعریفی تەواو پێویستیەتی.

ڕۆڵی عەقیدە لەم سنوورەدا ناوەستێت، بەڵکو زانست و زانیاریی و بەهاو بۆچوونەکان بەیەکەوە گرێ دەدات بە توندترین شێوە، کەش و هەوای فیکریی و عەقڵی و نەفسی دێنێتە کایەوە، کە دەبنە هۆی رێکخستنی بنەماکانی هێنانەدی مەعریفە بە یاساکانی یەکتاپەرستیی خوای گەورە لە پەرستنی و بە گەورە و دەسەڵات زانینی و سیفەتە بەرزەکانی، پاشان دەرگای ئاشکراکردن و لێکۆڵینەوەی زانستیی لە هەموو وردەکارییەکانی شێوەی کەون و ئاشکراکردنی ئاسۆکانی و هەموو بەشەکانی لەسەر تواناکانی مرۆڤ دەکاتەوە، تێگەیشتن لە مانای ژیان و نهێنییەکانی مرۆڤ و پێکهاتە عەقڵیی و دەروونی و جەستەییەکانی روون دەکاتەوە.

کەواتە عەقیدەی ئیسلامیی توانا عەقڵی و داهێنان و دۆزینەوەکانی مرۆڤ دەپارێزێت لە پەرتبوون و ونبوون لە بابەتە فەلسەفی و کەلامیە بێسودە گومڕاکەرەکان لەبارەی غەیب و پەنهانەوە، ڕێگایەکی فراوان دەکاتەوە بۆ دۆزینەوە و ئاشکراکردنی هەموو ئەو شتانەی لە جیهانی بینراو (عالم الشهادة)دا هەن کە تەنها ئەویٚ مەیدانی جێنشینی و خستنە بەردەستن (تسخیر)ی مرۆڤەکانە لەلایەن خواوە، واتە جێنشینی مرۆڤ لەسەر زەوی و بەردەست خستن (تسخیر)ی هەموو ئەوەی لە کەون دایە بۆ ئەو.

هەروەها عەقیدە بە پاکیی و ڕوونیی خۆیەوە کۆمەڵێك ئامانجی بەرز دەخاتە بەرچاوی ئینسان و کۆمەڵێك مەبەستی بڵند و بە نرخ پێشانی ئینسانەکان دەدات، کە کاروانەکەی دەپارێزێت لە شتی بێسوود و هەستکردن بە نەمان و فەوتان و خۆخواردنەوە و تەمبەڵیی، هانی دەدات لەسەر ئەنجامدانی ڕۆڵی ئاوەدانکردنەوە و شارستانی خۆی لە ژیاندا بە باشترین شێوە کە بتوانێت پایەکانی کۆمەڵ بەتووندیی بچەقێنیٚ، ئامانجە میحوەرییەکانی بنیات بنێت.

بەڕاستی "عەقیدەی ئیسلامیی" بنەمای توند و پتەوی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی پیشان دا لە سەردەمی نەوەی یەکەمی ئیسلامدا و بنەما کۆمەڵایەتیی و شارستانییەکانی لەسەر عەقیدە بنیاتنران، ڕەنگدانەوەی دروست کرد لەسەر بۆچوون و هەڵسوکەوتە عەقڵییەکانی تاکی مسوڵمان لەو سەردەمەدا، هەروەك چۆن ڕەنگی دابووەوە لەسەر بنەما ڕەوشتی و هەڵسوکەوتییەکان و یاساکانی مامەڵە و پەیوەندییەکان، بۆیە تێگەیشتن و ڕوونکردنەوە و لێکدانەوە و هەڵسەنگاندن زۆر قورسە بۆ هەریەکێك لەمانە بەبیٚ ڕەچاوکردنی ڕەنگدانەوەی عەقیدە لەسەریان.

لێرەدا دەکریٚ لەوە تێبگەین کە بۆچی هەموو هەڵسوکەوت و عیبادەتەکان بەستراونەتەوە بە مەرجی ئیمانبوون و بۆ خوا ئەنجامدان، هیچ کردەوەیەك و عیبادەتێك بۆیە قەبوڵ نابێت بەبیٚ هاتنەدی مەرجە سەرەکیەکەی و پایە گرنگەکەی، کە ئیمان و باوەڕبوونە، کەواتە ئیمان مەرجێکی سەرەکییە بۆ وەرگرتن و قبوڵبوونی هەر کردەوەیەکی پەیوەست بە ڕۆژی دواییەوە و پاداشتدانەوەی لە لایەن خواوە،

بەڵكو پێویستە بۆ بنیاتنانی ئیسلامیش لە ژیانی دنیادا.

کەواتە عەقیدە کەوتووەتە چەقی بازنەی ئیسلامەوە، بەوەشەوە ناوەستێ کە بریتی بێت لە هەندێك قەناعەتی عەقڵیی بە پایەکانی بیروباوەڕ و بنەماکانی، بەڵکو دەبێت لەمە تێپەڕێت بۆ "مامەڵە لەگەڵ هەموو ناواخنی ئینسان بەشێوەیەکی گشتیی و وەڵامی هەموو لایەنەکانی پەیوەست پێیەوە، بداتەوە و تێکەڵ ببێت لەگەڵ هەموو بنەما و ڕاگرەکانیدا، تێکەڵ ببێت لەگەڵ هەست و فیکر و بیر و هۆشی، لەگەڵ هەموو بەشەکانی هەستپێکردنی دیکەی مرۆڤ و ناوەڕۆکی مرۆڤایەتیی بەشێوەیەکی گشتیی، هەڵسوکەوت بکات لەگەڵ واقعی ماددیی ئینسان، ئەو واقعەی کە پێگە کەونییەکەی دایدەمەزرێنێت لەو شێوازەی کە دەربڕینی پێدەکات و سروشی پێدەکات و ڕێنمایی هەموو ئەو ناوەڕۆکانەی بەیەکەوە بە ڕێکی پێدەکات، ئەمەیە هەماهەنگیی و گونجانی فیترەت وەك ئەوەی کە خوا بۆخۆی بنیاتی ناوە"[1].

ئەو ئاوێتەبوونە گشتگیرە لەگەڵ "بوون و ناواخنی مرۆڤایەتیی" هەمووی توانای کارایی جوڵان و کارکردن بۆ گۆڕینی پێداویستییەکانی ئەم عەقیدەیە بۆ واقیعێکی هەستپێکراو لە مرۆڤدا دروست دەکەن، کە بازنەدارە بە سۆز و هەست و غیرەت و ئازایەتیی بۆ بانگکردنی خەڵك بۆ بەشدارییکردن لەم خێرەی کە ئەو تێیدایەتی، بەشداریکردنیان لە پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی گونجاو لەگەڵ یەکتر و یەکسان لەسەر بنەمای دڵنیابوون و دانپیانان بەوەی کە مرۆڤەکان هەموویان هاوشانی یەکترن لە مرۆڤێتییاندا و مرۆڤ جێنشینە لەم کەونەدا و هەموو کەون خراوەتە بەردەستی ئەو، ئەو ئەمانەتەی پێ هەڵگیراوەو و تەکلیفی ئاوەدانکردنەوەی زەوی بەسەردا دراوە، خوای گەورەش لەم کارەیدا هاوکاریەتی بە فێرکردنی و تێگەیاندنی و خستنە بەردەستی ڕاستییەکان بۆی کە بێ ماندووبوون پێیان دەگات.

بەم عەقیدە وەرگیراوە لە قورئانەوە کۆمەڵی یەکەمی مسوڵمانان ڕاهاتن بەو ڕاهاتنە ناوازەیە، سەرکردایەتی مرۆڤایەتییان وەرگرت و ئەم عەقیدە ناوازەیە فەرمانڕەوایی

[1] خصائص التصور الإسلامي: سەرچاوەی پێشوو.

مرۆڤایەتیی کرد بەشێوەیەك کە گەلان ئاشنا نەببوون بە هاوشێوەی ئەو فەرمانڕەوایەتیە، نە لە پێش و نە لە دوای ئەویش، ئەو تاکە نموونە جوانەی هێنایەدی بۆ مرۆڤ لە جیهانی ناوەڕۆك و هەستدا، یان لە جیهانی جوڵان و واقعدا، کە مێژوو شتی وای بەخۆیەوە نەبینیبوو، قورئان مەرجەع و سەرچاوەی یەکەمی ئەو کۆمەڵە بوو و لەوەوە هەڵقوڵابوون و سەرسامترین دیاردە لەمێژوی مرۆڤایەتیدا هەڵقوڵانی ئوممەتێك بوو لە دەقەکانی قورئان[1]، بە قورئانەوە ژیان و بە پلەی یەکەمیش پشتیان بە ئەو دەبەست، بەو پێیەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بێجگە لە نموونەی ئاراستەی قورئانی هیچ شتێکی دیکە نەبوون، وەك چۆن عائیشەی دایکی موسوڵمانان کورتی کردەوە کاتێك پرسیاری لێکرا لە ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش لە وەڵامدا ئەو وەڵامە گشتگیر و ڕاستگۆ و قووڵە دەداتەوە، دەڵێت: (ڕەوشتی ئەو قورئان بوو)[2].

## ئیبن تەیمیە و ڕاستکردنەوە لە بوارەکانی عەقیدەدا

لەم سۆنگەیەوە، شێخولئیسلام ئیبنوتەیمیە دەستی کرد بە جیهادکردنەکەی لە بواری ڕاستکردنەوەی عەقیدەدا، لە دوای ئەوەی کە هەستی کرد بەو لادانەی تووشی بووە، بۆیە ئیشی کرد لەسەر بنیاتنانەوەی بنەماکانی بە بنیاتنانەوەیەکی سەلەفیانەی پاك، پشتی دەبەست بە قورئانی پیرۆز و ئایەتەکانی لە بەڵگە هێنانەوە بۆ هەموو بوارێك لە بوارەکانی و پاککردنەوەی لە هەموو ئەو شتانەی کە پێوەی هەڵواسرابوو و چواردەوری درابوو لە خەوش و خاڵ، چاوڕۆشن بوو بە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، لە خوێندنەوەی وەحی خواییەوە دەستی کرد بە بنیاتنانەوەی ئەم عەقیدەیە خشت بەخشت، بە لە بەرچاوگرتنی وەزعی ئوممەتی ئیسلامیی لە سەردەمی خۆیدا و

---

[1] خصائص التصور الإسلامي: سەرچاوەی پێشوو.

[2] ئەم فەرموودەیە ئیمامی موسلیم و بەیهەقی لە کتێبی (السنن)دا و ئیمامی ئەحمەد و ئەبوداود ڕیوایەتیان کردووە لە عائیشەوە، وەك چۆن باس کراوە لە کتێبی: الفتح الكبير (٢٦٦/٢).

دووبەرەکیی و پەرتپەرتبوونەکانیان، بۆیە لە سەرەتادا دەستی کرد بە گفتوگۆ لەبارەی بۆچوون و گوتاری تاقم و کۆمەڵە جیاوازەکان، لادان و هەڵەکانیانی لە عەقیدەکەیاندا دەخستە بەردەستیان، بەڵکو ئەم تاقمە جیاوازانە بگێڕێتەوە ناو بازنەی یەك ئوممەت و زاڵ بێت بەسەر ڕا جیاییەکانیاندا کە بۆتە هۆی دووبەرەکییان، زۆربەی کتێب و نووسراوەکانی کە تاووتوێی بیروباوەڕی تاقمە ئیسلامییەکانی سەردەمی خۆی دەکرد، لەم سۆنگەیەوە هاتنە مەیدان لە ئامادەکردن و دانانیدا ـ واتە سۆنگەی پاکژکردنەوەی بیروبۆچوونە ئیسلامییەکان و ڕاستکردنەوەی عەقیدەیان و گێڕانەوەی یەکپارچەیی مسوڵمانان و دروستکردنی خۆشەویستیی لە نێوانیاندا لەسەر ئەو بنەما پتەوەی کە پشت دەبەستێت بە ڕاستکردنەوەی مەنهەجی تەواو- کە ئەم بۆچوونە دەبێتە هۆی هێنانەدی یەکهەڵوێستیی و یەکئامانجی لەدوای یەك ڕایی لەسەر چەمك و بیر و هزرەکان[1].

بەڵکو حەز و مەبەستە دروستەکانی شێخولئیسلام لەو بازنە ئیسلامییە تایبەتە دەرچوو بوو بۆ بازنەیەکی ئیسلامیی فراوانتر، ئەو بازنەیەی کە وا دەڕوانێتە ئیسلام کە کۆکەرەوەی هەموو پەیامی پێغەمبەرانە، بازنەی بێگەردیی لێبوردەیی ئیبراهیمی گشتگیر کە ئیسلام بە جوانترین و ڕاستگۆترین شێوە تەعبیری لێدەداتەوە (مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيّاً وَلاَ نَصْرَانِيّاً وَلَكِن كَانَ حَنِيفاً مُّسْلِماً وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ * إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِإِبْرَاهِيمَ لَلَّذِينَ اتَّبَعُوهُ وَهَـذَا النَّبِيُّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَاللّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ) (آل عمران: ٦٧ـ ٦٨ )، بۆیە کۆمەڵێك کتێبی بە نرخی دانا سەبارەت بە گفتوگۆ و هەڵسەنگاندنی هەندێ بیروباوەڕی جولەکە و گاورەکانی سەردەمی خۆی کە بۆیان مابۆوە لە باو و باپیرانیانەوە، تیایاندا ئەو گۆڕانکاریی و دەستکاریی و زیادکردن و کەمکردنانەی روونکردەوە کە تووشی ئەو ئاینانە هاتبوون[2]، ویستی ـ و توانیشی بیکات ـ بە

---

[1] لەوانە کتێبەکانی (رەحمەتی خوای لێبێت) سەبارەت بەڕەتدانەوەی تاقمە ئیسلامییە جیاوازەکان، وەك کتێبی (منهاج السنة النبوية) و کتێبی دیکە.

[2] وەك کتێبە بەنرخەکەی بە ناوی (الجواب الصحيح لمن بدّل دين المسيح) و کتێبی دیکە، کە هەندێکیان لە

هەستێکی بانگخوازانەی دڵسۆزانە، نەك بە ڕۆحی هێرشکەر و بەرگریکەر وا لە هەڵگرانی ئەو ئایینانە بکات کە چاوخشاندنەوە بە خۆیان و ئایینەکەیاندا بکەن و توانی زیادکردنەکانی مرۆڤ و دەستکارییەکانیان لە پەیامی پێغەمبەرەکانیاندا تێپەڕێنێت و لەبەر چاوی نەگرێت، بۆ ئەوەی بەرەیەك دروست بکات بە ڕووی بەرەی ئیلحاد و شیرك و بتپەرستییدا کە ڕێنمایی خوایی و دینی ڕاست باڵ بکێشێت بەسەریدا، کەواتە دەتوانین بڵێین ڕەهەندی جیهانگیریی ئیسلام روون و ئاشکرا بوو لەلای ئەو و پەیڕەوی دروستی دەزانی بۆ جێبەجێکردنی و ڕاستکردنەوەی بیروباوەڕ و بنیاتنانەوەی.

به ئاوەزمەند (عقلية)ی دانای لێزانی خۆی توانی چاو بخشێنێتەوە بە هەموو ئەو وتە و بانگەشە و بەلاڕێبردنانەی خاوەن کتێبە ئاسمانییەکانی دیکە کە لە ڕێیەوە دەیانویست ئەوە بسەلمێنن کە ئەو مژدەدەرەی تەورات و ئینجیل مژدەی هاتنیان داوە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا نییە (دروودی خوای لێبێت) و ئەو نیشانانەی کە هاتوون لەو کتێبانەدا تێکناکەنەوە لەگەڵ ئەو و شەریعەتەکەی، ئەگەر شتێك هەبێت بیسەلمێنێ کە پێغەمبەرە ﷺ، ئەوە دەبێت بڵێین ئەو تەنها پێغەمبەری عەرەبە بە تەنها و پەیامێکی پێیە تایبەتە بە ئەوان. کەواتە کۆتا پێغەمبەر نییە و هەڵگری پەیامی جیهانی گشتگیر و کۆتا نییە، کە ئەوان بەردەوام دەبن لە چاوەڕوانکردنی بەپێی بۆچوونی خۆیان، ئەو کتێبەشی کە هاتووەتە خوار بۆی (قورئان) حاکمی کۆتا نییە، کە حاکمیەتی خوایی بۆ گوازرابێتەوە کە لەناو نەوەکانی ئیسرائیلدا هەبوو، شەریعەتەکەی شەریعەتی ئاسانکاریی و میهرەبانیی نییە کە بارقورسی و تەنگانەکانیان لەسەر هەڵگرێت، بۆیە ئیبنوتەیمیە (خوای لێ ڕازی بێت) بەرپەرچی ئەم هەموو گومانانەی دایەوە و هەموو ئەو بۆچوونانەیانی کە بینایان کردبوو لەسەر کۆمەڵە گومانێك، هەڵیوەشاندنەوە لە دووتوێی چەند کتێب و لێکۆڵینەوەیەکدا کە تاکو

---

چاپ دراون، کتێبی (إقتضاء الصراط المستقيم) و هەندێکیان کراونەتە دووتوێی (مجموع الفتاوى لإبن تيمية) کە کۆکراوەی نووسینەکانیەتی.

ئێستاش بە سەروەتێك ئەژمار دەكرێ كە ناتوانرێ مەزەندە بكرێت بە پارە لە بوارەكانی (لیكۆڵینەوەی بەراوردی ئایینەكان) و وەڵامدانەوەی گومانە وروژێنراوەكان لەسەر بنەماكانی سرووش (وحي) خوایی، كە نە لە ڕابردوودا و نە لە داهاتوو تووشی هەڵوەشاندنەوە و تێكنەكردنەوە نابێت.

بۆیە شێخولئیسلام كاری كرد لەسەر دەرخستنی سەرگە (منطلق) سەرەكییەكان و هاوبەشەكانی ناو خەڵك، وەك یەكتاپەرستیی و پێغەمبەرایەتی و یەكپارچەیی خەڵك و میللەت و یەكتایی حەق و ڕاستی و بێهودە دروستنەكردنی خەڵك و حوكمكردنی سوننەتەكانی خوا لەسەر زەوی و ڕێكخستنی سەرچاوەكانی زانین و هۆكار و ئامرازەكانی و دیارییكردنی پەیوەندییان لەگەڵ یەكتری، بەڕاستی دەركی بەوە كردبوو (ڕەزای خوای لێبێت) كە دیارییكردنی جۆری پەیوەندیی لە نێوان سەرچاوەكانی زانیندا ڕەنگ دەداتەوە لەسەر دیاریكردنی مەیدانەكانی كارە مەعریفییەكان و كاریگەرییەكانیان، گومانی تێكنەكردنەوەو نەگونجانیان بەیەكەوە دەڕەوێنێتەوە، وەك ئەوەی بڵێی شێخولئیسلام ئەو ململانێ فیكرییەی كە باڵی كێشابوو بەسەر خاوەن ئایینەكاندا لەلایەك و تاقمە مسوڵمانەكانی پێوە سەرقاڵبووبوون و باڵی كێشابوو بەسەر گۆرەپانی ڕۆشنبیریی و زانینی گشتیی و زانینی ئیسلامیی بەتایبەتدا گرێدابێت لەگەڵ كرداری دیاریكردنی پەیوەندیی سەرچاوە مەعریفییە ئینسانییەكان و ڕێكخستنی چەندێتی ئەو پەیوەندییە لەلایەكی دیكەوە.

# هەڵوێستی ئیبن تەیمیە لەبارەی کافرکردنی ئەو تاقمە ئیسلامییانەی ڕاوبۆچوونی جیاوازیان هەبوو

ئیبنوتەیمیە ڕای وابوو کە کافرکردنی تاقم و زانایان و تاکی خەڵك و دانانیان بە داهێنەر لە دیندا (مبتدع)[1] و فاسقکردنیان، لەو بابەتانەن کاتێك سەرهەڵدەدەن کە ڕاجیاییەکان توند دەبنەوە و دەگەنە لوتکە و جیاوازیی و مشتومڕ و دەمەدەمێ زۆر دەبێت، پێیوایە خەڵکیی ئەم مەسەلانەیان بۆیە بە سادە و ئاسان گرتووە لەبەر ئەو حاڵەتە عەقڵیی و فکریی و نەفسیەی کە باوە لە ناویاندا، بۆیە شێخولئیسلام ئیبنوتەیمیە پێیوایە ئەم دووبەرەکییانە ڕەنگدانەوەی کۆمەڵێك دەرهاویشتەی سلبیی زۆرن کە لە پشوو کورتی و کەمیی وشیاریی و چاولێکەریی و دەمارگیریی و لەبیرکردنی ڕەوشتی ڕاجیایی و کەمی ڕۆحی زانست و فێربوون و ڕەچاونەکردنی بابەتییانە بۆ ڕاجیاییەکان و نەبوونی ڕەوشتی گفتوگۆکردن بەشێوەیەکی جوان و بەکەمزانینی یەکێتی گەلی مسوڵمانان و لەبیرکردنی ئەو مەترسیی و ڕووبەڕووبوونەوانەی کە تووشی دەبێت و لەبەرچاونەگرتنی بابەتە سەرەکییەکان و بێئاگابوون لە ئادابەکانی بانگەواز و بنەماکانی و ئادابی فەرمانکردن بە چاکەو بەرگریکردن لە خراپە پەیدادەبن، هەموو ئەمانەی باسمان کردن لەو شتانەن کە وا لە هەندێك خەڵك دەکەن دابڕینی وشەی کوفر و بیدعە و فسق و گومڕایی بەسەر هەندێك لە تاقم و کۆمەڵ و تاکی موسوڵماناندا بە ئاسان بگرن، بۆیە شێخولئیسلام ناڕەزایی خۆی دەردەبڕی بەرامبەر بەم دیاردەیە و زیادەڕەوەکانی لەو مەسەلەیەدا بانگهێشت دەکرد بۆ گەڕانەوە بۆ لای خوا و تەوبەکردن و بوونی هەندێکیان لەو کەسانە لەسەر پەیڕەوی ئیمام ئەحمەد، یان پەیڕەوی ئیمامی شافعی، ڕێگری لە شێخولئیسلام نەکرد کە هێرشیان بکاتە سەر و

---

[1] دیارە داهێنانی عیبادەت، بیروبۆچوونی عەقیدەیی کە لەگەڵ دەقەکانی قورئان و سوننەت نەگونجێن لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا شتێکی نەنگ و خراپە، بە پێچەوانەی داهێنان لە شتەکانی دیکەدا. ڕەنگە زاراوەی – مبتدع – دەستەواژەیەکی پڕ بەپێستیمان نەبێت لە کوردیدا. وەرگێڕ

گلەییان لێبکات، هەر بۆیە هێرشێکی توند دەکاتە سەر تاقمی (المرازقة)، کە شوێنکەوتووی شێخ عوسمانی کوڕی مەرزوق بوون، دەکرێت لە (مجموع الفتاوی)کەیدا سەیر بکرێ (ج٧/ص ٦٨٠–٦٨٦)، لەو گلەییانەی کردوویەتی لەو بارەیەوە دەڵێت: (لەو بیدعە خراپانە کافرکردنی تاقمێکی موسوڵمان بێجگە لەوەی باسمان کردووە و بەحەڵاڵزانینی خوێن و ماڵیان)، بە توندی وەڵامی ئەو کەسانەی داوەتەوە کە ئەم بیدعە خراپەیان داهێناوە و پاشان دەڵێت: (هاوەڵانی پێغەمبەر و گەورە زانایانی مسوڵمانی دیکە کۆکن لەسەر ئەوەی هەرکەسێك کە قسەیەکی هەبوو لەبارەی بابەتێکەوە بەهەڵەداچوو تیایدا بەوە کافر نابێت، با قسەیەکیش بێت پێچەوانە بێت لەگەڵ فەرموودەکانی پێغەمبەردا، چونکە کافرکردنی هەرکەسێك کە هەڵەیەکی ئەنجام دا، پێچەوانەی کۆڕای زانایانە)، هەروەها باس لە هەڵوێستی هەندێك لە شێخ و زانایانی هەندێك لەو تاقمانە دەکات، کە ناهێڵن شوێنکەوتووانیان ژن بهێنن لە شوێنکەوتوانی تاقمێکی دیکە و دەڵێت: (بۆ ئەو کەسانەی شوێنکەوتووانی ابن مرزوقن* دروست نییە ڕێگریی بکەن لە شوێنکەوتووانی عوفی* کە ژن و ژنخوازییان لەگەڵ بکەن، لەبەر ئەوەی کە بیروڕایان وایە کە هاوکوفی ئەوان نین، بەڵکو ڕێزدارترین دروستکراو لای خوا ئەوانەن کە تەقوا و خواپەرستییان زیاترە لە هەر تاقم و گرووپێك بن لەوان بن، یان لەوان نەبن).

ئەمە و ڕەنگە لە گرنگترین هۆکارەکانی زیادەڕەویی لە بڵاوبوونەوەی کافرکردنی خەڵك لەناو مسوڵماناندا ئەو بێئاگاییە زۆرە بێت لە زمانی شەریعەت و پەیڕەوەکانی

---

* ئیبن مەرزوق: ناوی عوسمانی کوڕی مەرزوقی کوڕی حەمیدی کوڕی سەلامەی قوڕەیشییە، کونیەکەی ئەبو عمرو، شەرعزانێکی پەیڕەوی مەزهەبی ئیمام ئەحمەدە و خاوەنی تەریقەتێکی سۆفییانەیە، لە ساڵی (٥٦٤هـ/ ١١٦٩م) مردووە.

* عوفی: ناوی قاسمی کوڕی سابتی کوڕی حەزمی عوفی سەرقەستییە، کونیەکەی ئەبو موحەممەد: ئەدیب و شەرعزانێکی ئەندەلوسییە و خاوەنی تەریقەتێکی سۆفییانەیە لە نێوان ساڵەکانی (٢٥٥هـ بۆ ٣٠٢هـ بەرامبەر ٨٦٩م – بۆ ٩١٥) ژیاوە.

مامەڵەکردن لەگەڵ زاراوەکان و وشە شەرعییەکاندا و تێگەیشتنیان لەناو دووتوێی سیاقی خۆیاندا، بە شێوەیەك بابەتێکی تایبەت (خاص)، گشتگیر (تعمیم) نەکرێت و بە پێچەوانەشەوە، هەروەها شتێك کە پەیوەست کراوە بە شتێکەوە حوکمەکەی ڕەها نەکرێت و بە پێچەوانەشەوە بەبێ بوونی بەڵگە و شارەزایی تەواو.

بەڕاستی وشەکانی (ئیمان و کوفر و دووڕوویی - نفاق) و وشە هاوشێوەکانیان چەندین وشەی شەرعیی گرنگن و زۆرێك لە هزر و حوکمەکانی لەسەر ڕاوەستاون، بۆ تێگەیشتن لێیان، گەڕانەوە بۆ فەرهەنگی وشەکان و گەنجینە موعجەمیەکان بەس نییە، بەڵکو دەبێت لەگەڵ ئەمانە چاوپیاخشاندنەوە بکرێت بە سیاقەکەی لە بازنەی ئەو دەقە جوزئیەدا و پاشان لە بازنەی ئامانج و مەبەستە گەورەکانی شەرعدا، زانایانی زانستی (أصول الفقه) کۆمەڵێك یاسا و بنەمای زۆریان هەیە دەکرێت سوودیان لێوەرگیرێت و گەشەیان پێبدرێت بۆ گەیشتن بە چەند ڕێسایەك کە مامەڵەکردن لەگەڵ دەقەکان ڕێکبخات. وشەی (کوفر)یش وەك وشەی (ئیمان) وایە، لەو وشانەن کە پەیوەستن بە بیروباوەڕ و کردارەوە، بۆ هەریەکێکیشیان چەند بەش و جۆر و پلە و مەرج و هۆکار و ڕێگری و چەندین بنەمای دیکە هەیە.

وشەی "کوفر" لە چەند شوێنێکدا لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، وەك چۆن بە زۆریی لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خواشدا هاتووە، لە هەندێك لەو دەقانەدا مەبەست پێی ئەو کوفرەیە کە مرۆڤ دەخاتە دەرەوەی بازنەی ئیسلامەتی و گەلی موسوڵمانان، ئەویش کافربوونە بە ئاشکرایی بە خوای گەورە و ئینکارکردنی پەرستشی ئەو، یان بوونی ئەو، یان بێباوەڕیی بە ناو و سیفەتە جوانەکانی ئەو، یان بەدرۆزانینی پێغەمبەران، یان ئینکارییکردنی کتێبە خواییەکان و ئینکارکردنی ئەو شتانەی کە لە ئایندا دیار و زانراون و جێگەی مشتومڕ نین و هاوشێوەی ئەمانە.

هەندێك لەم وشە و دەستەواژانە لەلایەن هەندێکەوە خراپ بەکارهێنراون و بەشێوەیەك تەفسیر کراون کە لەگەڵ ڕێنماییەکانی قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەر نایەنەوە، وەك لەمەودوا باسی دەکەین.

جاری وا هەیە وشەی "کوفر" بەکاردەهێنرێت لە دەقەکاندا مەبەست پێی مانا زمانەوانییەکەیەتی کە لە زمانی عەرەبیدا بە مانای داپۆشین و شاردنەوە دێت، نموونەش بۆ ئەم بەکارهێنانە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێ: "ئاگری دۆزەخم نیشان درا، بینیم بەشێکی زۆر لەوانەی تیایدان ئافرەتانن، چونکە کوفر ئەنجام دەدەن، پرسیاریان کرد لە پێغەمبەری خوا: ئایا کافر دەبن بە خوای گەورە؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی: کوفری چاکەی مێردەکانیان دەکەن، واتە ئەو چاکانەی لەگەڵیان کردوون دەیشارنەوە، ئەگەر هەموو تەمەنت چاکەت کرد بێت لەگەڵ یەکێکیان، پاشان شتێك ببینێ لێت کە بە دڵی نەبێت، دەڵێت: هیچ خێرم لە تۆ نەبینیوە"[١].

وەك چۆن ئیمامی بوخاریش ناونیشانی ئەو سەرەبابەتەی ئەم فەرموودەیەی تێدا هێناوە، ناو ناوە: (باب كفران العشير ـ دەروازەیەك کە باسی بێ سوپاسی بەرامبەر کەسوکار دەکات) و (كفر دون كفر ـ دەروازەیەك کە باسی ئەوە دەکات کوفرێك بچووکترە لە کوفرێکی دیکە) و لە بابەتێکی دیکەدا ناونیشانێکی هێناوە بە ناوی: (باب المعاصي من أمر الجاهلية ـ دەروازەیەك کە باسی ئەوە دەکات گوناهەکان لە ڕەوشتەکانی نەفامین).

شتێکی ئاشکرایە کە مرۆڤ کافر نابێت بە گوناهکردن، تەنها گوناهی هاوەڵ پەیداکردن بۆ خوای گەورە نەبێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کەسەی کە تانەی لە هاوەڵەکەی گرت ـ کە وتی: کوڕی دایك ڕەشەکە ـ وت: (تۆ نەفامیت تێدایە). ئیمامی موسلیم گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەری خواوە کە فەرموویەتی: (دوو شت لەناو خەڵکدا کوفریان پێوەیە، ئەوانیش: تانەدانە لە نەسەب و هات و هاوارکردنە لەسەر مردوو)، شێخولئیسلام ئیبنوتەیمیە لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێت: "هما كفر" واتە ئەم دوو خەسڵەتە کوفرن خەڵك تیایاندایە، بەڵام هەرکەس بەشێك لە کوفری تێدا بوو مەرج نییە ببێت بە کافرێکی تەواو، هەتا بە تەواویی و ڕاستیی بێباوەڕ و کافر

---

[١] ئیمامی بوخاری لە كتاب الإيمان ڕیوایەتی کردووە، باسی (كفران العشير) و (كفر دون كفر).

نەبێت[1].

شێخولئیسلام ـ لەم بابەتەدا ـ وەك باقیی زانا لێکۆڵەرەوەکانی ئەم ئوممەتە وایە، کە رازیی نەبوون خەڵکانێك کە خاوەنی یەك قیبلە و یەك کتێب و یەك خوا و یەك پێغەمبەربن، یەکتر کافر بکەن، تەنها ئەوانە نەبێت کە بە ئاشکرا کوفری بێ پێچ و پەنا، یان کوفری ڕەها ـ وەك ئیبنوتەیمیە ناوی ناوە ـ ئەنجام دەدەن، ئەویش ئەو کەسانەن کە دین بە درۆ دەزانن و شایستەی ئەوەن کە وشەی کوفر و ئەو وشانەی لێی پەیدا دەبنیان بەسەردا ببڕین.

(ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت:".. هەموو موسڵمانان کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێك شایەتومان نەهێنێت کافرە، بەڵام چوار کردەوەکەی دیکە ڕاجیایی هەیە لەسەر کافرکردنی ئەوانەی ئەنجامی نادەن وا وازی لێدێنن"، مەبەستیشی بە چوار کردەوەکە چوار ڕووکنەکەی دیکەیە، کە ئیسلام لەسەری وەستاوە و درێژە بە قسەکانی دەدات (ڕەحمەتی خوای لێبێت) و دەڵێت: "ئێمە ئەگەر بڵێین: ئەهلی سوننەت یەك ڕاین لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ بە گوناهکردن کافر نابێت، دیارە مەبەستمان پێی ئەو گوناهانەی وەك زینا و خواردنەوەی عارەقن، بەڵام ئەم بنەمایانە ئەوە لە کافرکردنی ئەوانەی تەرکیان بکات مشتومڕێکی زۆر لە نێوان زانایاندا هەیە"، مەبەستی لە بنەماکان ئەو بنەمایانەن کە ئیسلامیان لەسەر بەندە، بێجگە لە شایەتومان[2]. تەواوی ئەهلی سوننەت ئەوانەی لە بارەی تاقمە ئیسلامییەکانەوە نووسیویانە، هیچ یەکێك لە تاقمەکانیان نەخستۆتە دەرەوەی بازنەی ئوممەتی ئیسلامیی... ئەوەتا ئیمامی ئەشعەری کتێبەکەی لەبارەی تاقمە ئیسلامییەکانەوە ناو ناوە "مقالات الإسلاميين"، ئەگەر ڕەوا بوایە هەر یەکێك لەو تاقم و کۆمەڵ و مەزهەبانە یەکتر کافر بکەن، ئەوە وشەی "الإسلاميين" بەسەر هەموو ئەم تاقمانەدا دانەدەبڕاو نەیدەگرتنەوە.

---

[1] کتێبی "إقتضاء الصراط المستقيم" (٢/٢٠٧-٢٠٨).

[2] بگەڕێرەوە سەر کتێبی " الفتاوى" (٧/٣٠٢).

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: "بزانە کە مەزهەبی ئەهلی ڕاستی ئەوەیە کە ئێمە هیچ کەس کافر ناکەین لەوانەی ئەهلی قیبلەن بە گوناهکردن، ئەهلی ئارەزووبازی و بیدعە کافر ناکرێن"[1].

بەڕاستی زانا لێکۆڵەرەوەکانی ئوممەت ئەم ڕایەیان پەسەند کردووە، چونکە زانیویانە کە هەموو تاقمێك لە تاقمەکانی موسوڵمانان خۆیان بە تاقمی ڕاست و نەجات بوو لە ئاگر، داناوە و پێیانوایە لە ئیجتهادەکانیاندا پێکاویانە، بۆیە ئەگەر ئوممەت شلی بنوێنێت لە کافرکردنی یەکتردا ئەوا تەلاری ئوممەتی ئیسلامیی دادەڕمێت و بنەماکانی دەڕووخێت.

شێخولئیسلام (خوای گەورە بەرەحمی خۆی دایبپۆشێت) لەو زانایانەیە کە ویستویانە ئوممەت ئاگادار و وشیار بکەنەوە لەم جۆرە بڕیارە بێ بیرلێکردنەوانە (مجازفات)، بۆیە کۆمەڵێك بنەمای داناوە کە هاوشێوەکانیمان نەدیوە لە بەهێزی و چاوڕۆشنیی بە قورئان و سوننەتەوە و داگرندەیی بۆ زۆر بابەتی ورد کە بێجگە لەو، کەسی دیکە باسی نەکردوون.

هەروەها (ڕەحمەتی خوای لبێبێت) ویستویەتی بگەڕێت بەدوای ڕەچەڵەکی ئەو ناڕەحەتیانەی کە تووشی ئوممەتی ئیسلامیی بووە و بۆتە هۆکاری پەرت بوون و ڕاجیاییان و کەوتوونەتە ناو کافرکردنی یەکتر و فاسقکردنی یەکتر و بە موبتەدیع زانینی یەکتر، لەوانە لە کتێبی (الفتاوی (١٠/ ٣٥٤-٣٨٦) و (٣/٢٠٢-٢٣١) لە کۆتایی باسەکەی لە (٣/ ٢٢٧ و دواتر)دا دەڵێت: "خەڵکی هەموویان دەزانن کە لە نێوان حەنبەلییەکان و ئەشعەرییەکاندا عاجزی و دەنگ دابڕان و ڕقبوونەوە لەیەکتر هەبوو، من لە هەموو کەس زیاتر حەزم لە یەکدڵیی مسوڵمانانە، داوای یەکڕاییان دەکەم و لە هەموو کەس زیاتر حەز دەکەم شوێنکەوتووی فەرمانی خوایی بم لە یەکڕیزیدا، بۆیە هەموو ئەو دابڕان و بێتاقەتییەم لە دڵەکانیاندا لابرد و بۆم روونکردنەوە کە ئیمامی ئەشعەری لە بەڕێزترین زانایانی ئەهلی کەلامە کە لەسەر مەزهەبی ئیمام ئەحمەدە

---

[1] بگەڕێرەوە سەر "شەرحی ئیمامی نەوەوی بەسەر صەحیحی موسلیمەوە" (١/ ١٥٠).

(ڕەحمەتی خوای لێبێت) و هاوشێوەکانی ئەو، ڕێبازەکەی ئەوی سەرخستووە، من ئەمانەم بۆ حەنبەلییەکان روون دەکردەوە و لەکاتێکدا قسەی ئیمامی ئەشعەرییم ئاشکرا کرد و حەنبەلییەکان بینییان وتیان ئەمە باشترین قسەی شێخ موەفەقە (واتە ئیبنو تەیمیە)، موسوڵمانان دڵخۆش بوون بە یەك قسەییان، پاشان (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: "ئاشکرایە هەموو تاقمەکان هەیانە لار و لەوێرە و هەیانە دامەزراوە، من لە هەموو کەس زیاتر نەهی دەکەم لەوەی کە خەڵکانێك کافر بکرێن، یان فاسق بکرێن، یان گوناهبار بکرێن، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە بەڵگەیان لەسەر بچەسپێت لە بابەتێکدا کە ئەگەر پێچەوانە بووەستێت هەندێکجار کافر دەبیٚ، فاسق دەبن لە هەندێك حاڵەتدا، گوناهبار دەبن لە هەندێك حاڵەتی دیکەدا، من پێموایە خوای گەورە لە هەڵەکانی ئەم ئوممەتە خۆش بووە بەو هەڵانەشەوە کە لە بابەتەکانی عەقیدە (الخبرية القولية)، لە بابەتە کردەوەییەکانی بێجگە لە عەقیدە (المسائل العملية)". پاشان دەڵێت: "بە بەردەوامیی پێشین (سلف) ڕا جیاییان بووە لەسەر زۆرێك لە بابەتەکان و هیچ یەکێکیان ئەوی دیکەیانی کافر، یان فاسق، یان گوناهبار نەکردووە"، لەسەر ئەم بابەتە هەندێك نموونە دێنیتەوە، پاشان دەڵێت: "کافرکردنی خەڵك لەو بابەتانەیە کە هەڕەشەی لێکراوە، تەنانەت ئەگەر قسەیەك بەڕاست نەزانینیش بووبێت بۆ ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، بەڵام دەکرێت ئەو کەسەی دەیڵێت تازە موسوڵمان بووبێت، یان لە لادێیەکی دوور، گەورە بووبێت، نموونەی ئەمانە کافر ناکرێن بە نکوڵییکردنی بابەتێك، هەتا بۆیان روون نەکرێتەوە، دەکرێت ئەو کەسەی نکوڵیی دەکات ئەو دەقەی نەبیستبێت، یان بیستبێتی، بەڵام لای ئەو نەچەسپیبێت و ڕاست نەبێت، یان بەڵگەیەکی دیکەی لابێت پێچەوانەی ئەو بەڵگەیە بێت کە وای لێکردبێت بەڵگەی یەکەم بەشێوەیەکی دیکە ڕاڤە بکات، یا نەشیپێکابێت".

درێژە بە باسەکەی دەدات و دەڵێت: "من هەموو جارێك ئەو فەرموودەیە باس دەکەم کە لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە لەبارەی ئەو پیاوەی وتی: (ئەگەر مردم بم سوتێنن، پاشان خۆڵەمێشەکەم ورد بکەن و بڵاوی بکەنەوە لە دەشتێکدا،

چونکه سوێند به خوا ئەگەر خوا دەسەڵاتی زیندووکردنەوەی لاشەمی ببێت سزایەکم دەدات کەسی لە جیهانەکاندا ئاوا سزا نەدابێت، وایان لێکرد، خوای گەورە پێی فەرموو: چی وای لێکردی کە وا بکەی؟ وتی: ترسی تۆ، بۆیە خوای گەورە لێی خۆش بوو)، ئەم پیاوە گومانی هەبوو لە دەسەڵاتی خوا کە بتوانێت لەم وردە تۆزە لاشەی دروست بکاتەوە، بەڵکو پێی وابوو زیندوو ناکرێتەوە، ئەم بۆچوونەش بە کۆدەنگی مسوڵمانان کوفرە، بەڵام نەزان بوو، ئەوەی نەیدەزانی کە خوا دەتوانێت ئەوە بکات و مسوڵمان بوو لە خوا دەترسا کە سزای بدات، بۆیە خوا لێی خۆش بوو".

پاشان دەفەرموێ (ڕەحمەتی خوای لێبێت): "ئەوەی کە ورد بێتەوە لە ئەهلی ئیجتهاد کە زۆر مەبەستیانە شوێن پێی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەڵبگرن، دەزانێت کە ئەوان شایستەترن بۆ لێخۆشبوونی خوایی لەم پیاوە".

(ڕەحمەتی خوا لێبێت) ئەم بابەتانەی لە زۆر شوێندا باس کردووە، لە کتێبی (الفتاوى)کەیداو لە زۆرێك لە کتێبەکانی دیکەیدا، ئەگەر کۆیان بکەینەوە ئەوە دوو بەرگی گەورەمان بۆ کۆدەبێتەوە، کە هەموو بابەتە سەرەکیی و لاوەکیی و بنەماکانی دەخولێتەوە لە بازنەی مەسەلەی کافرکردن و فاسقکردن و بەلاڕێ دانانی خەڵك و ئاگادارکردنەوەیان لەم بابەتانە، ترسناکیی ئەم بابەتانە ڕووندەکاتەوە بۆ مسوڵمانان و ئێمە پێمان وانییە کە لە ئیسلامدا جێگەی هەموو لادانێکی عەقیدەیی و زانستی دەبێتەوە، نەخێر هەندێك بیروبۆچوون هەیە مرۆڤ دەردەکات لە بازنەی ئیسلام و ئوممەت، هەندێك کردەوە و هەڵسوکەوت هەن سەر دەکێشن بۆ ئەوە، بەڵام کافرکردن مەرج و هۆکار و ڕێگری خۆی هەیە، دەبێت تێیان بگەین.

هەروەها درێژەی تاووتوێی بیروباوەڕی تاقمەکان و قسە و باسەکانیان دەبێت لە مەیدانی لێکۆڵینەوە زانستییەکان و کۆڕ و کۆبوونەوە زانستییە هاوبەشەکان و گفتوگۆ مەعریفییەکاندا بێت، نەك لە ڕۆژنامەکان و گۆڤارە دەورییەکان، تەنانەت نابێت لەناو کتێب و فەتوا گشتییە بڵاوکراوەکان، یان لەسەر ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان، یان لەسەر کاسێتی تۆمارکراودا بورژێنرێت کە دەکەوێتە بەردەستی هەموو موسوڵمانان لە کاتێکدا

که خەریکە زانستی شەرعیی و تێگەیشتن لە زاراوە و بۆچوونە شەرعییەکان نەمێنێت، ئەمەی ئەمڕۆ ڕوودەدات فیتنە و دووبەرەکیی و پەرتبوون و جیاجیایی و غەریبی ئیسلام و موسوڵمانانە، ئای چەندە پێویستە بۆ زانایانی هاوچەرخ کە بڕواننە پاشماوەی ئەو زانا بەکردارانە و شوێن ڕێنماییەکانی ئەوان بکەون[1].

## پەیڕەوی ئیبنو تەیمیە لە گفتوگۆکردندا

لەبەر ئەوانەی باسمان کردن، ئیبنو تەیمیە لە سەرەتادا هەرگیز پەنای نەدەبردە بەر بەرزکردنەوەی چەکی کافرکردن و فاسقکردن و تەبدیعکردن بە ڕووی تاقمە جیاوازەکاندا، بەڵکو هەموو توانا و هێزی خۆی بەکاردەهێنا بۆ چوونەناو عەقڵیان لە دەرگا مەعریفییەکانەوە، ئەگەر بەدەنگەوەهاتنی پێویستی هەست پێنەکردبا زۆر بێتاقەت و تووڕەو بێزار دەبوو، هەندێکجار دەبووە ئەو شەڕکەرەی کە هەندێك لەو دەستەواژانەی تێدەگرتن[2] پاڵنەریشی لەوەدا "ئەو تەبیعەتە توندەی بوو کە بەهۆی حاڵ و وەزعی خراپی مسوڵمانان و ئوممەت زۆر زیادی کردبوو، کە وای لێکردبوو وا دەردەکەوت کە هەندێکجار زۆر توند بێت لەگەڵ بەرامبەرەکانیدا، کە گفتوگۆ

---

[1] سوپاس بۆ خوا لەم دواییەدا کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی باش دەرچوون لەبارەی ئاگادارکردنەوە لە کافرکردنی خەڵك، لەوانە: "الغلو في الدين في حياة المسلمين المعاصرة ـ زیادەڕەویی و ڕۆچوون لە دیندا لە ژیانی موسوڵمانانی هاوچەرخدا"، دانراوی شیخ عەبدولڕەحمانی کوڕی مەعلا ئەللوەیحق، ئەم کتێبە نامەیەکی زانکۆیی ناوازەیە پرۆفیسۆر (زين العابدين الركابي) سەرپەرشتی نووسینی کردووە. چاپی: مؤسسة الرسالة، بیروت ١٩٩٢م، هەروەها کتێبەکەی (د. نعمان السامرائي) "التكفير جذوره، أسبابه، مبرراته ـ کافرکردن، ڕەگە مێژووییەکەی، هۆکارەکانی، بەهانەکانی"چاپی: المنارة ١٩٨٦م. هەروەها (شیخ یوسف القرضاوي) کتێبەکەی بڵاو کردۆتەوە "ظاهرة الغلو في التكفيرـ دیاردەی ڕۆچوون لەکافرکردن" چاپی: مكتبة المنار الإسلامية، چاپی: دووەم ٥ـ ١٤، بێجگە لە چەند بابەتێکی دیکە، کە لێکۆڵینەوەی دیکە گرتوویانەتە خۆ لەم بابەتەدا.

[2] واتە: کافرکردن یان فاسقکردن یان بە موبتەدیع دانانیان. وەرگێڕ

هەندێکجار لەمشتومڕ بەشێوەیەکی جوان و بەکارهێنانی "القنفلة" (واتە ئەگەر وترا) و دەگۆڕا بۆ وەسفدارکردنی یەکتر بە بیدعە گومڕایی و ڕەنگە کافرکردنیش"[1]، بەڵام ئەمە کۆتا چەکی بوو، نەك یەکەم چەك، کەواتە چەکی یەکەمی گفتوگۆ و بیر گۆڕکێی فیکریی و مەعریفیی بوو کە پلەبەندیی گفتوگۆی لەخۆدەگرت لە پێشەکییەکانەوە تا ئەنجام، لە چەند هەوڵێکی زۆر دڵسۆزانەدا بۆ کردنەوەی چاوی نەوەکانی ئوممەت هەموویان بۆ حەقیقەت و ڕاستییەکان.

هەروەها توندبوون و هێرشەکانی بۆ سەر تاقمە جیاوازەکان لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت هۆکاری پەیوەست بە سەردەمی خۆیەوە هەبوو لەو قۆناغەدا، با نموونەیەك وەربگرین لە هەڵوێستەکانی، بۆ نموونە هەڵوێستی بەرامبەر (ڕافزەکانی شام) و قەبیلەکانیان لە شاخی (الجرد)، کە پێکهاتبوون لە چەند تایەفە و تاقمێك لەوانە (باتنییەکان و ئیسماعیلیەکان و شوێنکەوتوانی (الحاكم بأمر الله)، (کە خۆی بە خوا دەزانی)، نوصەیریە توندڕەوەکان)، ئەم قەبیلانە لەبەر چەند هۆکارێك هەڵوێستی نەشیاویان هەبوو بەرامبەر ئوممەتی ئیسلامیی لە شەڕەکان لەگەڵ خاچپەرستەکان و پاشانیش لەگەڵ تەتار، کە ئەم هەڵوێستانە ناشێن بۆ کەسانێك کە خۆیان بە ئوممەتی ئیسلامیی بزانن، چونکە ئەمانە هەڵوێستی دژ بە ئوممەت بوون و پشتیوانییکردنی دوژمنەکانی ئوممەت بوون، بەپێی ڕیوایەتی مێژوونووسان (تابوری پێنجەمیان) دروست کردبوو، کە هەندێك زیانیان گەیاند بە شەڕکەرانی مسوڵمانان بەوەی هەندێکیان دەعوەتنامەیان نارد بۆ سەرکردە خاچپەرستەکان، پاشان بۆ سەرکردەکانی تەتار بۆ هێرشکردنە سەر وڵاتی مسوڵمانان، کاتێك کە هاتن تەواوی ئاسانکارییان بۆ فەراهەم هێنان، عەزیەتی خەڵکیان دەدا وەك چۆن خاچپەرستەکان و تەتارەکان عەزیەتیان دەدان، بەڵکو هاوبەشیان کردن لە سزا و تۆڵەسەندنەوە لە برا

---

[1] بۆ نموونە بڕوانە: مجموع الفتاوى (٣/ ٣٨١-٣٨٤)، هەروەها نامەکەی بۆ (سلطان ناصر) لە (٢٨/ ٣٩٨ و دواتر)دا. هەرکەس مەبەستی بێت دەتوانێ بگەڕێتەوە سەر کتێبی (شيخ الإسلام إبن تيمية) لاپەرە (٢٦) هی أبو الحسن الندوي، کتێبی (ابن تيمية) هی شێخ ئەبو زهرە.

**مسولْمانەكانيان!! و هاوقەوم و نيشتمانيانى خۆيان، بۆيە شێخولئيسلام فەتواى دا كە ئەو خەڵكانەى وەك بەنى نەزير وان، دروستە بڕينى دارەكانيان و دار خورماكانيان، بۆخۆشى بەشداريى كرد لە هێرشبردنە سەريان[1]، ئەو فەتوايانەى كە هەيەتى لەم بارانەوە پێويستە ڕەچاوى هەموو ئەو زەمانانە بكرێ كە پەيوەستە پێيانەوە، ئەم فەتوايانە وەرناگيرێن و كاريان پێناكرێت بەجيا لەو زروف و زەمانە كە تيايدا دراون، بەتايبەت كاتێك هەڵوێستەكان دەگۆڕێن و دەورەكان جيا دەبن، چونكە ـ هەندێكجار ـ زاناى مسولْمان فەتوا دەكاتە چەكێك بەكارى دێنێت بۆ ديفاعكردن لە ئوممەت و پاراستنى لە شەڕێك كە ڕەنگە ئەم فەتوايە كاريگەريى هەبێت لەسەر لابردنى، ئەمە فەتواى شەڕكەرێكى موجاهيدە لە مەيدانى شەڕدا (هەڵوێستى ئەم كەمينانە زۆر جار دووبارە دەبنەوە لە سەردەمە جياجياكاندا و دەبێت هۆكارى خۆى هەبێت كە شايستەى لێكۆڵينەوەيە، تەنها پاڵنەرى جياوازى مەزهەبيى ناكرێت بەهانە بێت بۆ دانەپاڵ دوژمن.**

**دەتوانين بڵێين لە پێشەوەى ئەم هۆكارانە ڕژێمى حوكمڕانى ديكتاتۆريى بوو لەو سەردەمانەدا كە داخراو بوو و فرسەتى دەربڕين و هەستكردنى ئەو كەمينانە بە بەشدارييكردن لە ژيانى گشتييدا، پێنەدرابوو، بۆيە دوژمنانيش ئەو هەلەيان دەقۆستەوە و هەست و سۆزيانيان بەلاى خۆياندا ڕادەكێشا و هاوكارييانيان بەدەست دەهێنا بەهۆى سوودوەرگرتن لەو حاڵەتەى ئەوان)، بەڵام شێخولئيسلام لە كاتە ئاساييەكاندا بە هەموو توانايەكيەوە هەوڵى دەدا بابەتە خيلافييەكان شى بكاتەوە، پێكهاتەكانى روون بكاتەوە و بەشە سەرەكييەكانى كە لێوەى دروست دەبن، باس بكات و گفتوگۆيان لەبارەوە بكات.**

**ئەو بەڵگە فەرموودەيى و عەقلْيانەى كە هەن لەوبارەيەوە، دەهێنانەوە بە مەبەستى قەناعەتكردن بە غەيرى خۆى بە روونكردنەوەى شێوازى بەڵگەهێنانە**

---

[1] بگەڕێرەوە سەر كتێبى (الفتاوى) لەسەر ئەم بابەتانەى پێشوو و هاوشێوەكانى كە باسمان كردن و كتێبى: شيخ الإسلام إبن تيمية: دانراوى شيخ الندوي، سەرچاوەى پێشوو.

جیاجیاکانی له چەسپاندنی بۆچوونەکانی خۆی و گفتوگۆکانیشی لەگەڵ ئەشعەرییەکان و سۆفییەکان و موعتەزیلەکان دەشێن بۆ نموونەی ئەمەی باسمان کردن.

## هەڵوێستی بەرامبەر سۆفییەکان

گفتوگۆکانی ئیبنو تەیمیە و هەڵوێستەکانی لەگەڵ سۆفییەکان بەپێی تەریقەتەکانیان جیاوازە و دەگۆڕێت و بەیەك چاو سەیری هەموویان ناکات و جیاوازیی دەکات لە نێوان تەسەوفی سوننەتییانە و تەسەوفی بیدعی، بە یەکەمیاندا هەڵدەدات و مەدحی پیاوە گەورەکانی دەکات، هێرش دەکاتە سەر جۆری دووەم[١]، هێرشەکانیشی بۆ سەریان بەپێی تاقمەکانیان دەگۆڕێت، هەڵوێستەکانیشی بەپێی داهێنراوەکانیان و دامەزراوی و ڕۆچوویی لە ناویاندا جیاوازن، یان سادەیی و لاوازیی ئەو داهێنراوە لە لایان و نزیکیی لە سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ، یان دووری لێیەوە، لە هەموو کەس زیاتر ئەو پیاوەی کە ناسرابوو بە شێخی گەورە (محي الدين بن عربي) پشکی هێرشەکانی ئیبنوتەیمیەی بەرکەوتووە، چونکە ئیبنو تەیمیە تەواوی نووسراوەکانی ئیبن عربی خوێندبووەوە و کتێبی (الفتوحات المكية) و کتێبی (فصوص الحكم) کە ئەم دوو کتێبەی لە زۆرترین کتێبە بەردەست و بڵاو و کاریگەرەکان بوون لە ناو ناوەندە زانستییەکاندا.

ئیبنو تەیمیە بۆی دەرکەوت کە "گونجاندن لە نێوان ڕاوبۆچوونەکانی ئیبن عەرەبی کە لەو دوو کتێبەدا هاتوون و ڕێنماییەکان، پێغەمبەرایەتی کارێکی نەتوانراوە و تێکناکەنەوە"، بۆیە هێرشی کردە سەری و خەڵکی لێئاگادار کردەوە[٢]، توندیی نواند

---

[١] بگەڕێرەوە بۆ بەرگی دەیەم لە کتێبەکەی (مجموع الفتاوى) لە بابەتی زانستی سلوك – ڕەفتار، بەرگی یازدە لە هەمان کتێب بۆ زانینی هەڵوێستی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەبارەی تەسەوفی سوننی و تەسەوفی بیدعیی.

[٢] بگەڕێرەوە سەر (الفتاوى) (٧/ ٥٩٤ و دواتر و زۆرێك لە بابەتی تر لەو بەرگەدا)، هەروەها کتێبی: شیخ

لەگەڵ شوێنکەوتووەکانی ئەو لە ئەهلی تەسەوف.

وا دەردەکەوێ کە خەڵکیی ـ لە سەردەمی شێخولئیسلامدا ـ زۆر ڕۆچووبوون لە باوەڕبوون بە "یەکپارچەیی بوون ـ وحدة الوجود" و پەنابردن بۆی بە شێوەیەك سنوورەکانی شەرع و ئایین و هەڵسوکەوت و ئەخلاقیان بەزاندبێت تیایدا، ئەم لادانە بیروباوەڕییە بووبێتە گرفتێکی بیروباوەڕیی لە سەر ئاستی ئوممەت و بێئاگای کردبێت لەو مەسەلە ترسناکانەی کە بەرەو ڕووی دەبوونەوە، لەگەڵ ئەوەشدا شێخولئیسلام رووبەڕووی ئەم قەیرانە بووەوە بەشێوەیەك کە جێگەی ئاوڕدانەوەیە، بۆخۆی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: "کەسانێك گومڕا بوون لەم بابەتەدا (باوەڕبوون بە یەکپارچەیی بوون ـ وحدة الوجود)، کە شارەزاییان هەیە لە بوارەکانی زانستی کەلام و فەلسەفە و تەسەوف کە ئەمانە گونجاون لەگەڵ ئەم بیروباوەڕە، لەوانە: ابن سبعین و صدر القونوی ـ قوتابی ئیبن عەرەبی ـ، بەلیانی و تەلمەسانی، ئەمیان (تەلمەسانی)، لە هەموویان زیرەکتر و وردترە لە ڕووی زانست و مەعریفەوە، بە ئاشکرا ئەو مەزهەبەی هەڵگرتبوو و عارەقی دەخواردەوە و شتە قەدەغەکراوەکانی ئەنجام دەدا"[1]، شێخولئیسلام نامەیەکی دوورودرێژ دەنووسێت لە ساڵی (٧٠٤ هـ) بۆ شێخ (أبي الفتح نصر المنبجي)، کە لە گەورە شێخانی ئەهلی تەسەوف بووە لەو سەردەمەدا و یەکە ناودارەکانی شوێنکەوتوانی شێخ (محي الدين ابن عربي) بووە، لە هەموو شێخەکان لە لای (بيبرس الجاشكير) نزیکتر بووە، دەڵێت لە نامەکەدا: "ئەگەر من پێموا نەبێت کە زیانی ئەوانە لە سەر ئەهلی تەریقەتی خوایی و شێنکەوتووانی ئەو لە گەورەترین واجبەکانە و وەك شەڕکردن لەگەڵ تەتار و لابردنی زیانەکانیانە لەسەر مسوڵمانان، ئەوا هیچ پێویستییەك نەبوو لەسەر ئەوانەی کە باوەڕیان هەیە بە خوا و پێغەمبەری خوا کە نهێنییەکانی ئەو ڕێچکەیە ئاشکرا بکەن و پەردە لەسەر عەیب و عارەکانیان هەڵدەنەوە، بەڵام شێخ (خوا چاکی بۆ بکات) دەزانێت مەبەست لە

---

الإسلام ابن تيمية، أبي الحسن الندوي، سەرچاوەی پێشوو.

[1] سەرچاوەی پێشوو.

بانگەوازی پێغەمبەران، بەڵکو مەبەست لە دروستکردنی بوونەوەر و ناردنە خوارەوەی کتێب و ناردنی پێغەمبەران ئەوەیە کە ئایین تەنها بۆ خوا بێت و دروستکراوەکان تەنها داوا لە دروستکراوی خۆیان بکەن، ئەمانە یەکتاپەرستییان لە خەڵکی شێواندووە، ئەو یەکتاپەرستییەی کە خوا کتێبەکانی لەسەر ناردووە و پێغەمبەرانی بۆ ناردووە، ئەو یەکپارچەیی بوونە (اتحاد الوجود)ی کە ناویان ناوە یەکتاپەرستیی و ڕاستییەکەی یەکخستنی دروستکەرە و نکوڵیکردنە لە خالق، ئێمە جاران کە گومانی چاکمان دەبرد بە ئیبن عەرەبی و بە گەورە سەیرمان دەکرد لەبەرئەوە بوو کە لە کتێبەکانیدا کۆمەڵێك شتی سوودبەخشم بینیبوو، لەوانە زۆرێك لە وتەکانی لە کتێبی (الفتوحات) و (کنە المحکم المربوط) و (الدرة الفاخرة) و (مطالع النجوم) و هاوشێوەکانی، ئێمە ئەو کاتە لە مەبەستی ڕاستەقینەی ئەو حاڵی نەبووبووین و کتێبی (الفصوص)یمان نەخوێندبووەوە، ئێمە لەگەڵ برا خواییەکانماندا دەمانویست شوێنی حەقیقەت بکەوین و ئەم ڕێگەیە روون بکەینەوە، کاتێك کە مەسەلەکەمان بۆ دەرکەوت زانیمان دەبێت چی بکەین، کاتێك لە ڕۆژهەڵاتەوە کۆمەڵێك شێخ و زانای شیاو هاتن و پرسیاریان کرد لە بارەی ڕاست و دروستی تەریقەتی ئیسلامیی و ئایینی ئیسلامەوە و ڕاستێتی حاڵ و وەزعی ئەمانە، واجب بوو لەسەرمان روونکردنەوە بدەین، کاتێك کە لەملاولای شامەوە خەڵکێکی هەڵگری ڕێگای خوایی و عیبادەت و ڕاستگۆیی نامەیان بۆ نووسین تیایدا داوایان کردبوو کە وردەکاریی کۆی مەبەستی ئەم تاقمە روون بکەمەوە بۆیان، روونکردنەوەمان دا، هیوام وایە شێخ (خوا پشتیوانی بێت) بەو نورەی کە لە دڵیایەتی و ئەو زیرەکیەی کە هەیەتی و ئەو نیەتە ڕاستەقینەی هەیەتی لە ئامۆژگارییکردن بۆ ئیسلام و خەڵکەکەی و ئامۆژگاری بۆ برا خواپەرستەکانی، ئەوە ئەنجام بدات کە ڕەزامەندیی خوای گەورە و ڕاستیی ناسینی ئەوی تێدایە لە دنیاو قیامەتدا".

هەر لەم نامەیەدا شێخولئیسلام درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت: "بەڵام ئیبن عەرەبی نزیکترینیانە لە ئیسلامەوە و قسەی جوان دەکات لە زۆر شوێندا، ئەو جیاوازیی دەکات لە نێوان (المظاهر والظاهر) ـ واتە ڕووکەش و ئەوەی کە دیارە، بۆیە

دان دەنێت بە فەرمانەکان و بەرگریی لێکراوەکان و حوکمە دارێژراوەکان وەك ئەوەی هەیە، فەرمان دەکات بە ڕێگای صالّح گرتن لەو بابەتانەی کە شێخەکان خەڵکیی لەسەر هان دەدەن لە ڕەوشت و عیبادەتەکان، بۆیە زۆرێك لە خەڵکیی سوودیان وەردەگرت لە قسەکانی بۆ نزیکبوونەوە لە خوا، ئەگەرچی ڕاستی قسەکانیشی تێنەدەگەیشتن بە تەواوی، بەڵام ئەوانەی هاوڕابوون لەگەڵی جوان تێی گەیشتبوون"[1].

لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت: "ئەم مانایانە هەمووی هی خاوەنی کتێبی (الفصوص)ن، خوای گەورە بۆ خۆی دەزانێت ئەم پیاوە لەسەرچی مردووە، خوا لە هەموو مسوڵمان و ئیمانداریکی نێر و مێ خۆش بێت، ئەوانی زیندون و ئەوانەش کە مردوون: (وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلّاً لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ) (الحشر: ١٠)"[2].

ئەم نامەیە لە چاوگ و سەرچاوەکانی ئەو دەقانە دادەنرێت کە لەبارەی "ڕەوشتی ڕاجیایی ـ أدب الإختلاف"دا هەن، کاتێك ئەم نامەیە هەمووی دەخوێنیتەوە دەبینیت شێخولئیسلام هەموو لادانە عەقیدەیی و فکرییەکان دێنێتە مەیدان کە ئەم جۆرە بیرکرنەوانەی لێکەوتۆتەوە، شوێنی ڕچە مێژووییەکەی دەکەوێت تا گرێی دەدات بە باقی لادانە عەقیدەییەکانی "گاورەکان"ەوە، ئەو لادانانەی کە کۆدەنگیی گاورەکانی نەهێشت لە سەردەمەکانی پێشوودا، کردنی بە چەند تایەفە کە شەڕیان دەکرد لەگەڵ یەکدی وەك: (یەعقوبییەکان و نەستوورییەکان و مەلکانییەکان و ئەوانی دیکە)، بەمە ئیبنوتەیمیە پەنجەرەیەکی فراوان دەکاتەوە بەسەر جۆرێك لە لێکۆڵینەوەی دیکە کە ئێمە ئەمڕۆ زۆر پێویستیمان پێیەتی ئەویش (بەراوردی ئاینەکانە) و چۆنیەتی گواستنەوەی بیروبۆچوونە ئاینییەکان، بەتایبەت نادروست لادراوەکان لە ئاینێك و خەڵکەکەیەوە بۆ ئاین و خەڵکی ئاینێکی دیکە.

---

[1] بگەڕێرەوە سەر: الفتاوی (٢٣٩/١١) و دواتر، هەروەها سەرچاوەکانی پێشوو.

[2] سەرچاوەکانی پێشوو.

شێخولئیسلام بەڕاستی توانیویەتی درێژەی کۆمەڵێك وردەکاریی بهێنێت لە بارەی بیروباوەڕی (الحلول والإتحاد - ئاوێتە بوون و یەکپارچەیی بوون) و چۆنیەتی بڵاوبوونەوەی بەناو تاقمەکاندا و کاریگەرییە وێرانکەرەکەی لەسەر عەقیدە و ڕەوشت و هەڵسوکەوت، هاتووە بەشەکانی (حلول و إتحاد)ی روون کردووەتەوە، هەریەکەیانی دابەش کردووە بۆ دیارکراو (معین) و ڕەها (مطلق) و مەبەست پێیانی باس کردووە.

فیکری ئیبنو تەیمیە هەرگیز گشتگیریی نەناسیووە لە کاتی ڕەخنەگرتندا، ئەو گشتگیرییەی کە باڵی کێشابوو بەسەر عەقڵ و هۆشی هاوچەرخەکانیدا، بەسەر ئەوانەی دوای ئەوان هاتن، بوو بە نەخۆشییەکی ترسناك تا ئەمڕۆش پێوەی دەناڵێنن، ئەو دەهات لاڕێییەکانی - بە بۆچوونی خۆی - لە فیکری تاقمێکدا ئاشکرا دەکرد و هەوڵی دیاریکردنی و تایبەتکردنی دەدا و دوور دەکەوتەوە لە گشتگیرکردن و دابڕینی ئەو سیفەت و ڕەخنەیە بەسەر هەموو ئەو تاقم، یان کۆمەڵەدا، ئەمە هەڵوێستی بوو کاتێك ڕەخنەی لە تاقمێك دەگرت، بۆ نموونە کاتێك ڕەخنەی لە ئەشعەرییەکان گرتبایە، بە گشتیی ڕەخنەی نەدەگرت، بەڵکو تاقمێکیانی لە سەرکردە فیکرییەکانیان هەڵدەبژارد کە بۆچوونی تایبەتیان هەبوو و کاریگەرییان هەبوو لەسەر بنیاتنانی فیکرییان[1]، بە ئەرکی ڕەخنەگرتن و شیکردنەوەی بۆچوونەکانیان هەڵدەستا، ئاواش هەڵسوکەوتی دەکرد لەگەڵ ئەهلی تەسەوف و شیعە و جەهمییەکان و ئەوانی دیکەدا.

لە هەموو ئەمانەدا هەوڵی دەدا پارێزگاریی بکات لە سەر یەکپارچەیی ئوممەت لە هێڵە پانەکانیدا و ئەو ساتانەی روون دەکردەوە کە کاریگەرییان هەبوو بوو لەسەر دروستبوونی ئەم ڕاجیاییانە لە بۆچوونەکاندا و هاتبوونە گۆڕەپانی فیکریی ئیسلامییەوە بەهۆی هەندێك هەڵە و لادانی مەنهەجیی، یان مەعریفیی، کە شێخولئیسلام باش دەیتوانی بیانپێکێت و ئاشکرایان بکات، تەنانەت لەگەڵ حلولی و

---

[1] سەرچاوەکانی پێشوو، و کتێبی: ابن تیمیة: دانراوی ئەبو زهرە، و دەڵێین (زۆر کات – ڕەحمەتی خوای لێبێت – وشەی کوفر و دەرچوون و بیدعەی داوەتە پاڵ بۆچوونەکە، نەك هەڵگرەکانی، بۆ ئەوەی خۆی بپارێزیت لە دانەپاڵی شتێك لەمانە بۆ کەسێك کە شایستەی نەبێت).

ئیتحادییەکانیشدا بە گشتیی کافر و گومڕای نەدەکردن و هەموویانی وەك یەك سەیر نەدەکردن، وەك لەمەوپێش بینیت (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە بارەی ئیبن عەرەبییەوە چی دەڵێت، پاشان باسی ئەوانی دیکە دەکات، لە بارەی سەدرەددینی قەنوجییەوە دەڵێت: "ئەو دوورترە لە شەریعەتی ئیسلامەوە لە ئیبن عەرەبی"، وەلامی تەلمەسانی و ئیبن سبعین دەداتەوە بە توندیی، بەلام هێرشێکی توند دەکاتە سەر تەلمەسانی و دەڵێت: "ئەو تاوانبارە و لە هەموویان پیسترە و لە هەموویان زیاتر ڕۆچووە لە کوفردا، ئەو جیاوازیی ناکات لە نێوان (الوجود والثبوت)، بەلام ئیبن عەرەبی جیاوازی دەکات لە نێوانیاندا، جیاوازیی ناکات لە نێوان (ڕەها– المطلق و دیارییکراو ـ المعین) وەك ئیبن رومی جیاوازی دەکات لە نێوانیان، لەلای ئەو "هیچ کەسێك جیا نییە و هەمووومان یەکێکین، بە هیچ شێوەیەك لە یەکتر جیانین، مرۆڤ کاتێك هەست بە جیاوازیی دەکات لەگەڵ ئەوی تردا کە پەردە بە سەر چاویەوەیە، کاتێك ئەو پەردەیە هەڵمالڕا دەزانێت کە هەمووومان یەکین و جیا نین".

ئەم کابرایە هەموو شتێکی قەدەغەکراوی بە حەلاڵ دەزانی، هەر بۆیە شێخولئیسلام تا ئەو ڕادەیە توند بوو لەگەڵی، چونکە ئەوانەی کە هەڵخەڵەتاوی بیری تەلمەسانی بوون و شوێنی کەوتبوون، زۆر بوون، وا دەردەکەوێت لێزان بووبێت لە کاریگەرییکردن لە خەڵك، ئەوەتا لە کاتێکدا کە شێخولئیسلام ناوی دەبات بە حەلاڵکەری قەدەغەکراوەکان، لای شوێنکەوتووانی نازناوی (داوێنپاك تەلمەسانی) هەبوو، بەلام ئیبنو تەیمیە لەگەڵ هەموو ئەم شتانەشدا بەردەوام جیاوازیی دەکرد لە نێوان تەسەوفی سونی و تەسەوفی بیدعیدا و زۆر جار بەسەر جونەیدی بەغدادی و ئەبو تالبـی مەککی و شێخ عەبدولقادری گەیلانی و هاوشێوەکانیاندا هەڵیدەداو باسی دەکردن بە چاکە،[1] وەك لەمەوپێش باسمان کرد.

---

[1] التصوف في فتاواه، سەرچاوەی پێشوو.

# حەزنەبوونی لە چاولێکەریی (التقلید)[1]

شێخولئیسلام هەرگیز حەزی لە چاولێکردن (تقلید) نەبووە، نە لە لایەنگیرییەکانیدا و نە لە دوژمنایەتیکردنەکانیدا و نە لە ڕەخنەگرتن و نە لە هیچ کارێك لە کارەکانیدا، ئەمەش بە پێچەوانەی ئەوەی کە باو بوو لە سەردەمی ئەودا، چونکە لە سەردەمی ئەودا لێکۆڵینەوەکان ڕێگای لایەنگیری فیکریی و چاولێکەریی تەواویان گرتبوو، هەموو ئیمامێك کۆمەڵێك شوێنکەوتووی هەبوو نەك تەنها لە فیقهدا، بەڵکو لە عەقیدەشدا، ڕاجیاییش پەیدا بوو بوو لە نێوان زانایاندا، کە دەگەڕایەوە بۆ ئەو ڕاجیاییانەی کە لە سەدەی چوارەمدا دەستی پێکرد و ئەوەی بەدوایدا هات لە دەمارگیریی مەزهەبیی، جا لە بابەتە فیقهییەکاندا بێت، یان لە بابەتە ئوصولییەکاندا، دەبینیت زۆرێك لە کتێبە گەورەکان شەرحکردن و ڕاڤەکردنن بۆ ڕا جیاییە کۆنەکان و باسکردنی ڕاو بۆچوونە جیاوازەکان و پاشان دەمارگیرییە بۆ یەکێك لەو ڕایانە.

ئەم مەسەلەیە گواسترایەوە بۆ هاوچەرخەکانی ئیبنوتەیمیە، ئەمەش یەکێك بوو لەو بابەتانەی کە جێگەی مشتومڕی نێوان ئەم و ئەوان بوو، ئەوان شوێنی ناوی پیاوەکان دەکەوتن و ئەمیش شوێنی بەڵگەکانیان دەکەوت، لای هەرکەسێك بوایە و لە هەرکوێ بوایە.

ئەگەر سێ سەدەی شەشەم و حەوتەم و هەشتەم جیا بکرێتەوە بە هەر زانستێك، ئەوە جیادەکرێتەوە بە زۆری زانیاریی و دانانی کتێبە داگرندە (موسوعة)کان، نەك بە زۆری فیکر و هزر، زانیارییەکان زۆر بوون لەو سەردەمەداو هەوڵ و کۆششیش بۆ پەیداکردنیان زۆر بوو، بەڵام بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندنیان بە بەڵگە و پێوانە عەقڵییە تەواوەکان بەبێلایەنیی، کەم بوو، ئەمە گونجاو نەبوو لەگەڵ ئەو هەموو سەروەتە

---

[1] وشەی تقلید زاراوەیەکی فیقهیی و ئوسوڵییە، بە مانای: شوینکەوتنی قسەی زانایەك بەبێ سەیرکردنی بەڵگەکەی، بۆیە ماناکردنی بە وشەی (چاولێکەریی) پڕ بە پێستی نییە، بەڵام وشەیەکی بەرامبەریمان لە کوردیدا نییە. وەرگێڕ

زانستییه دەوڵەمەندەی کە هەبوو لەو سەردەمەدا، چونکە ئەگە بڕوانین زۆرێك لە مەوسوعەکان لە بوارەکانی فیقهـ و فەرموودە و تەفسیر و مێژوودا نووسراون لەو سەردەمەدا، بەڵام نەقڵکردنی ڕا و بۆچوونی مەزهەبەکان و شوێنکەوتنیان و چاولێکەرییان باو بوو، بیری جیاوازی سەربەخۆ بەهێز نەبوو و ڕەواجی نەبوو.

لەگەڵ کەمی هەبوونی خاوەن عەقڵە مەعریفی و مەنهەجییەکان، ئەو عەقڵانەی کە دەیانتوانی چاولێکەریی تێپەڕێنن، جۆرێك لە ترساندنی فیکرییش لە ئارادا بوو، کە شەرعزانەکانی تەقلید پیادەیان دەکرد، لەگەڵ ترساندنێکی ڕەسمیی دەسەڵات کە دەیویست ئەو عەقڵیەتە چاولێکەریی (تقلید)ە بهێڵێتەوە، بەڵام شێخولئیسلام ئیبنو تەیمیە توانی ئەوە هەمووی تێپەڕێنێت، هەموو ئەو بەربەستانە ببڕێت بە ئازایەتییەکی ناوازە کە لە ئازایەتییەکەی ئیمامی مالیك دەچوو لە فەتوا تایبەتییەکانیدا، وەك فەتواکەی لەبارەی نەکەوتنی تەڵاقی زۆرلێکراو بە تەڵاقدان و ئازایەتی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە خۆڕاگریی و ڕازی نەبوونی بە وتنی دروستکراوی قورئان (خلق القرآن)[1]، هەڵوێستی زۆرێك لە هاوشێوەکانیان لە زانایان و ناوداران کە مێژووەکانیان پڕیەتی لە هەڵوێستی جوامێرانە کە بوونەتە هۆی پارێزگاریکردن لە زۆریك لە پایە و بنەمای ئەم ئوممەتە و بابەتە دیارەکانی دینەکەی.

---

[1] لەو هەڵوێستانەی کە بە نموونە دەهێنرێتەوە بۆ خۆڕاگری ئیمامی مالیك، ئەو هەڵوێستەیەتی کە فەتوای دا بە نەکەوتنی تەڵاقی کەسێك بە زۆر تەڵاقی پێبدرێت، لە دوای ئەوەی کە عەباسییەکان تەڵاقیان خستە ناو بەیعەتەوە، واتە ئەوەی بەیعەتی دابا دەبوو تەڵاقیشی خواردبا کە نایشکێنێ بۆ ئەوەی خەڵك بەیعەت نەشکێنن، بۆیە ئەم فەتوایەی ئەو وەك هاندانی خەڵك بوو لەسەر بەیعەت شکاندن، یان بڵێین ئاوا لێکدرایەوە لە ڕووی سیاسییەوە، هەروەها هەڵوێستی ئیمام ئەحمەد و وەڵامنەدانەوەی فشارەکانی خەلیفە مەئمون و موعتەزیلەکان بۆ وتن بە بۆچوونی دروستکراوی قورئان، کە نەچووە ژێری، چونکە ئەمە تانە بوو لە ڕەهایی قورئانی گەورە و ئەزەلیەتی ئەو، پێشخستنی بەڵگەی عەقڵی بوو بەسەر بەڵگەی دەقەکاندا، بۆیە ئەم هەڵوێستەی (ڕەحمەتی خوای لێبیت) نموونەی پێدەهێنرێتەوە لە بۆ خۆڕاگریی زانایان و دامەزراوییان.

# بڵاوبوونەوەی هەندێك لە ئیجتهادەكانی

شێخولئیسلام هەستی كرد (دیاردەی تەڵاق)[1] كە بڵاوبووبووە و سەری كێشابوو بۆ تێكدانی هەزاران ماڵ و خێزان، لەبەر ئەوەی كە خەڵكی لە بازنە شەرعییەكەی تەڵاق لایاندابوو كە خوای گەورە لەگەڵ كۆمەڵێك حوكمی تایبەت بە خێزان دایناون بۆ ئەوەی ببنە وەسیلەیەكی شەرعیی بۆ لێكترازاندنی ئەو گرێدانە خێزانییە بەشێوەیەكی باش لە نێوان ژن و پیاوێكدا كە ژیانی هاوبەشیان بۆ ماوەیەك دەریخستووە كە ناتوانن بەردەوام بن بەیەكەوە بۆ دروستكردنی خێزانێكی ئیسلامیی تەواو، بەڵام خەڵكیی لەم بازنە شەرعییە دەریانكردبوو كردبوویان بە سوێندێك سوێندیان پێدەخوارد، وەك چۆن سوێندیان بە خوا دەخوارد، ئەگەرچی ئەوەی لەم سوێند بە تەڵاق خواردنە پەیدا دەبوو زۆر ترسناكتر بوو لەوەی لە سوێند بەخوا پەیدا دەبوو، هەروەها كردبوویان بە وەسیلەیەك بۆ پەستان خستنەسەر بەرامبەر و زۆرلێكردنی و چەكی هەڕەشە بۆ سەری، بەهۆیەوە زۆر لە خێزانەكان پەرت بووبوون، كۆمەڵگای بەهێز دەبێت چۆن بێت كاتێك خێزان تیایدا پان بوویەوە و تەلارەكەی ڕووخا؟! بۆیە شێخولئیسلام (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لێكۆڵینەوەی لەم مەسەلەیەدا دەستپێكرد لە هەموو ڕووەكانیەوە و بۆی دەركەوت كە ئەوەی كە بە كۆدەنگی زانایان (إجماع) دانراوە لەم مەسەلەیەدا، كۆدەنگ نییە، بۆیە ئاشكرای كرد:

أ ـ تەڵاق ناكرێت سوێند بێت، ئەگەر وشەكانی وەك سوێند بەكارهێران ئەوە ناكەوێت، سوێندخۆرەكە تاوانبار دەبێت، چونكە سوێندی بە غەیری خوا خواردووە.

ب ـ تەڵاقخواردن بە سێبەسێ هەر سێ تەڵاقەكە ناخات، بەڵكو یەك تەڵاق دەخات، ئەگەر مەرجەكانی دیكەی تێدا بوو.

ج ـ فەتوای دا كە تەڵاقدانی ئافرەت لە حەیزدا تەڵاقی بیدعییە و ناكەوێت، بەڵگەی

---

[1] بگەڕێرەوە سەر: اسبوع الفقه الإسلامي ومهرجان ابن تيمية: ص٦٨٣، لێكۆڵینەوەی شێخ موحەممەد ئەبو زوهرەیە.

شەرعی هێنایەوە لەسەر بۆچوونەکانی لە هەموو ئەم بابەتانەدا، بەڵام لە لای ئەهلی چاولێکەریی (تقلید)، بوونی بەڵگە، یان نەبوونی، گرنگ نییە، چونکە ئەوان هەمیشە چاویان لەسەر یاساکانی چاولێکردن (تقلید) بوو بۆ ئەوەی بیپارێزن، چونکە قەیرانە فیکرییەکەیان وایلێکردبوون کە وابزانن تەنها چاولێکردن (تقلید) گرەنتی پاراستنی هەموو دەستکەوت و پیرۆزییەکانە، بۆیە چاولێکەرەکان (مقلدین) دەیانزانی کە ئەگەر شێخولئیسلام وازی لێبهێنرێ و ڕێگریی ئەم فەتوایانەی لێنەکرێت ئەوە چاو پیاخشاندنەوە دەکات بۆ هەموو پاشماوەی فیقهی ئیسلامیی و دەگەڕێتەوە سەری بە ڕەخنەگرتن لێی و ڕاستکردنەوەی بە پەیڕەوێکی مەعریفیی لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ، ئەوکاتە پایەکانی چاولێکردن (تقلید) لەرزۆك دەبن، بنەماکانی دەڕووخێن و خەڵکیی دەگەڕێنەوە سەر سەرچاوە سەرەکییەکانی ئیسلام و ڕاستەخۆ مامەڵە لەگەڵ ئەوان دەکەن، بۆیە عەقڵ و بیرەکان دەگۆڕێن، نوێگەریی ڕاستەقینە دروست دەبێت، ڕەنگە دەزگای زۆریش برمێن کە ئەم خەڵکانە ڕاهاتوون لەسەر بوونی و کۆمەڵێك بەرژەوەندیی و شتی وەقفی پەیوەست پێوەی کە لەسەر ئەم مەسەلەیە بنیاتنرابوون، تێکبچن و کۆمەڵێك هۆکاری دیکە، خەڵکیی کۆمەڵێك پاشماوە و کەلتووری زۆر بەجێدێڵن کە زۆرێك ڕاهاتوون لەسەر بوون بە مجێور و خزمەتکار بۆی و هیچ و هۆکاری ژیانی دیکە شك نابەن بێجگە لەم مجێوریی و خزمەتکارییە.

## ئەو میحنەت و نارەحەتییانەی تووشیان بوو

لێرەدا مەبەستەکانی سوڵتان و زانا چاولێکەر (مقلد)ەکانی سوڵتان یەکدەگرن، ئەم جارەیان لەسەر حەپسکردنی شێخولئیسلام و عەزیەتدانی (ئەم ڕێکەوتنەی دەسەڵات و زانایان لەو ڕێکەوتنە کەمانەیە کە لەوکاتەوەی کە قورئان و سوڵتان لێکترازاون بە کەمیی ڕوویداوە)، ئەوە بوو سوڵتان فەرمانێکی دەرکرد بۆ شێخولئیسلام کە لەمەودوا نابێت فەتوا بدات لە مەسەلەی تەڵاقدا بە فەتوایەك کە پێچەوانەی کۆدەنگ (إجماع) و

هەر چوار مەزهەبەکە بێت، ئەویش وەڵامی فەرمانەکەی سوڵتانی نەدایەوە و جێبەجێی نەکرد و ڕانەوەستا لە فەتوادان.

بەردەوام بوو لەسەر فەتوادان لەو بارەیەوە، هەرکەس پرسیاری لێکردبا وەڵامی دەدایەوە و فەتواکەی بە بەڵگەوە بۆ روون دەکردەوە، کە چۆن ئەو بەڵگانە ئەوە دەگەیەنن کە ئەو لەسەریەتی و پێهەڵخلیسکانی ڕای باوی زۆرینەی زانایانی لەم مەسەلەیەدا روون دەکردەوە.

ئەم جارەیان مەجلیسێکی بۆ ڕیکخرا کە لەناویاندا موفتی و قازییەکان و هەندێك لە شەرعزانەکانی تێدا بوون، شێخولئیسلام هێنراو نووسراوێکی تازەی سوڵتانی بەسەردا خوێنرایەوە کە جەخت دەکاتەوە لەسەر ڕێگرتن لێی لە فەتوادان بەو بابەتانەی کە هاوڕانین لەگەڵ کۆدەنگ (إجماع)ی زانایان!! داوا لە شێخولئیسلام کرا کە پەیمان بدات لەسەر فەتوانەدان بەو بابەتانە، ئەویش پەیمانی نەدا، مەجلیسەکە بڵاوەی کرد بەبێئەوەی کە ئەوەی دەیانەوێت لە شێخ بەدەستی بێنن، لە دوای ئەوەی کە هەوڵەکانیان چەند بارەبووەوە لەگەڵ ئیبنوتەیمیەدا و ئەو کۆڵی نەدا و ڕانەوەستا لە فەتوادان لەو بارانەوە، سوڵتان و زاناکان پەنایان بردە بەر کۆتا دەرمان وەك دەوترێ، ئەم جارەیان لە کۆشکی دەسەڵات مەجلیسیان بۆ بەست کە جێگری سوڵتان و قازییەکان و فەتوادەرەکان و شەرعزانەکان لە هەر چوار مەزهەبەکە ئامادەی بوون و شێخولئیسلام هێنراو سەرزەنشتیان کرد و تکایان لێکرد کە چیتر فەتوا نەدات لەو بارانەوە، ئەوەی جێگەی تێڕامانە هیچ جارێك لەو مەجلیسگرتنانە گفتوگۆی زانستیی، یان ڕاگۆڕکێ (مناظرة) و مشتومڕ ڕووی نەدا سەبارەت بەم بابەتانە، بەڵکو هەموو جارێك سەرزەنشتکردن و فشاری بەرێزانە و هەوڵدان بۆ قەناعەتکردن بە شێخ دەدرا بۆ گوێڕایەڵیی، چونکە بابەتە ورووژێنراوەکان بابەتی فیقهیی بوون، دەبوو بۆ زانینی ڕاستی و هەڵەیی سەرچاوەی گەڕانەوەی هەموان بەڵگە شەرعییەکان بوونایە، نەك قامچی و سجنکردن، پێویست بوو گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوەی زانستیی گرنگترین شت بوونایە پەنای بۆ ببرێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، بەڵام هەمووان ڕێگەکەیان نزیك

کردەوە و ئەوەیان تێپەڕاند هەتا دەرچوونی فەرمانێك بە حەبسکردنی شێخ دەرچوو لە حەپسخانەی (القلعة) لە شاری دیمەشق، حەپسکردنەکەی لە (٢٢) ڕەجەب دەستی پێکرد ساڵی (٧٢٠ه) و بەردەوام بوو تا ١٠ موحەڕرەمی ٧٢١ه[1].

ئەم دیاردەیە لە مێژووی ئێمەدا شایستەی لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەیە، تا ئێستاش هەندێك لە شەرعزانەکان و مەلا و موفتییەکان پەنا دەبەنە بەر دەسەڵات و سوڵتان بۆ وەستاندن و سەرکوتکردن و ڕاگرتن و بێدەنگکردنی ڕای جیاواز، هەتا ئەمڕۆش ئەم شێوازی مامەڵەکردنە لەگەڵ ڕای جیاوازدا ڕێگەی نەداوە بە چەسپاندن و ڕەچاوکردنی هەندێك ڕێنمایی ئادابی گفتوگۆ و لێکۆڵینەوە و ڕاگۆڕکێ، بەوەی ڕای جیاواز بە ئاشکرا دەرببڕدرێت بۆ لێوردبوونەوە لێی و زانینی ڕاستی و دروستی، یان چەوتێتییەکەی و ئەو بەڵگە و سەرچاوانەی کە هەیەتی و ئەو پەیڕەوەی پیادە کراوە بۆ گەیشتن بەم ڕایە.

دەتوانین بڵێین سەردەمی عەباسییەکان هەندێك هەوڵی وا درا لەم بوارەدا، بەڵام لەلایەن سیاسەتمەدارەکانەوە بوو و بە سەرپەرشتی ئەوان بوو، بۆیە بە هیچ گەیشت، ئەگەر پایەکانی توندوتۆڵ کرابان لە لایەن ئەهلی فیکر و زیکرەوە بە دانانی بە نەریتێکی زانستیی، تەنها لەناو ناوەندە زانستییە سەربەخۆکاندا گەشەی کردبا ئەوە زۆرێك خێر و بێری لێدەکەوتەوە و ڕاو هزری ئازاد دەبووە شەشەمینی پێنج پێویستییەکە (الضروريات الخمسة) کە مەبەستەکانی شەریعەت پێکدێنن، یان تێکەڵ بە یەکێکیان دەکرا، بۆیە دەبینین زۆرێك لەو زانایانەی کە خۆیان پەنا دەدا لەژێر سێبەری دەسەڵاتدارەکاندا بۆ پاراستنی ڕا و بۆچوون و مەزهەبەکانیان، تووشی هەمان عەزیەت و چەرمەسەری دەبوون کاتێك کە ڕا و بۆچوون و هەڵوێستەکانیان دەگۆڕا.

دیاردەیەکی دیکە کە زیان و ترسناکیی لەوەی پێشوو کەمتر نەبوو، ئەویش دیاردەی پەلەکردن لە تۆمەتبارکردنی خاوەن ڕای جیاواز، یان مەزهەبی جیاواز بوو، ـ هەندێکجارـ تۆمەتبار دەکرا بە کافر بوون، یان فاسق بوون، یان گومڕابوون، یان بوونی

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٦٨٥.

بە موبتەدیع، یان هەڵگەڕاوە لە دین.

لەو هۆکارە گرنگانەش کە لە پشت ئەم هەڵوێستەوە بوون، حەزکردن بوو بە دابڕینی خاوەن ڕای جیاواز لە ئوممەت و بێبەشکردنی لە کەمترین سۆز و پشتگیریی لەبەر بۆچوونەکانی و قەدەغەکردنی بیروبۆچوونەکانی، کە ئەم هەڵوێستەش پێچەوانەیە لەگەڵ هەڵوێستی قورئان کە ڕێگە دەدات بە پەیڕەو و بۆچوونی خەڵکانی دیکە قسە و باسەکانیان بە باشتر لەوەی کە خۆیان پیشانی دەدەن و باسی دەکەن، باس دەکات، پاشان وەڵامیان دەداتەوە و هەڵیاندەوەشێنێت و بەڵگەی عەقڵیی و لۆجیکیی و بەرجەستە و تاقییکراوە دێنێتەوە لەسەر بەتاڵیی ئەو ڕایە.

ئەمە ئەو پەیڕەوەیە کە دەبێت مسوڵمانان شوێنی بکەون و لە هەموو کات و شوێنێکدا پەیڕەوی بکەن. قورئانی پیرۆز بەڵگە دەهێنێتەوە بۆ ئەو شتانەی دەیەوێت بیانچەسپێنێت بەبێ ئەوەی ڕەچاوی هەڵوێستی خۆفەرزکردن و خۆ بەبەرزتر زانین بکات، بەهانەش بۆ ئەم حاڵەتە بەم ئایەتە دێنێتەوە: (رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزاً حَكِيماً) (النساء: ١٦٥)، واتە: بۆ ئەوەی خەڵکی هیچ بەڵگە و عوزرێکیان نەمێنێت لەسەر خوا لە دوای ناردنی پێغەمبەران، بەمەش قورئان ئەو عەقڵە بەڵگەئامێزە درەوشاوەیەی هێنایە کایەوە کە توانی ئەو نوێگەرییە شارستانییە بنیات بنێ لە کاتێکی سنوورداردا کە مرۆڤایەتی هاوشێوەی ئەوەی بەخۆیەوە نەبینیبوو.

کەواتە مەسەلەکە لە لای مسوڵمانان گەڕانە بەدوای ڕاستیدا و ملکەچبوونە بۆی کاتێك کە پێی گەیشتن، لەلای کافرەکان زاڵکردن و ڕەواجدانە بە بەتاڵ، یان بە حەقیقەت بەبێ لێکۆڵینەوە و گەڕان.

بەڕاستی پەیڕەوی قەدەغەکردنی بیروبۆچوونەکان و تەشویش خستنە سەر هەڵگرانی بانگەواز و تۆمەتبارکردنی خاوەن عەقڵ و تێگەیشتن و قەڵەمەکان، پیشەی کافرەکان و هاوەڵ پەیداکەرەکان و لووتبەرزەکان بوو، ئەوان بوون کە گفتوگۆیان ڕەتکردەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ و ڕێگەیان بە بانگەوازەکەی گرت،

تۆمەتباریان کرد بە سیحر و شێتی و شیعر و درۆ و چیرۆك و ئەفسانە و فێر بوون لە خەڵکانی دیکە، هەر ئەوانبوون پەیمانیان دەبەست لەگەڵ یەکتری کە گوێی لێنەگرن (وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ) (فصلت: ٢٦)، واتە: کافرەکان وتیان گوێ لەم قورئانە مەگرن کە گوێتان لە خوێندنەوەکەی بوو قسەی هەڵیت و پەڵیت بکەن بۆ ئەوەی گوێتان لێنەبێت و لێی حاڵی نەبن، بەڵکو زاڵ بن بەسەریاندا.

ئەوان و خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان، ئەوانە بوون کە ڕێنماییەکانی کتێبەکانی خۆیانیان شاردەوە و خۆیان هەڵواسیبو بەوەی کە لەسەری بوون و دروشمەکەیان بریتی بوو لە: (وَلاَ تُؤْمِنُواْ إِلاَّ لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ) (آل عمران: ٧٣) واتە: ئێوە باوەڕ مەهێنن تەنها بەوانە نەبێت کە شوێن ئاینەکەی خۆتان کەوتوون.

بەڕاستی لادان لەو ڕێبازە قورئانییەی باسمان کرد، زۆر زیانی بە ئیسلام و مسوڵمانان گەیاندووە و بۆتە هۆی دواکەوتنیان، بۆتە هۆی دواکەوتنی فکریی ڕێك و تەواو لە لایان و ئێشکگرتن لە کۆمەڵێك فیکری مردوو کوشندە کە مانەوە لە سەریان میکرۆبی لەناوبردنە بۆ قەوارەی عەقڵیی و نەفسیی ئوممەتی ئیسلامیی.

بەڕاستی زۆرێك لە گەورە زانایانی ئوممەت بە درێژایی مێژوو بوونەتە شەهیدی ڕا و بۆچوون و حەق وتن و گیانیان لەو پێناوەدا بەخشیوە، زۆرێکی دیکە لە تاریکیی حەپسخانەکاندا چەندین ساڵ ون کراون بە تۆمەتی فەتوای جیاواز لە حەز و ئارەزووەکانی سوڵتان و شەرعزان و مەلاکانی چواردەوری، یان لەبەر دەربڕینی ڕایەك کە جێگەی قبوڵ نەبووە لەلایان.

ئەوەی سەیری کتێبەکانی پلەبەندیی زانایان و سەرگوزشتەی ژیانیان (الطبقات والتراجم) بکات، ئەبینێت کە زۆرێك لەوانە تۆمەتبار کراون بە چەندین تۆمەت لەوانە هەڵگەڕانەوە لە دین، زۆرێکیش کوژراون، یان حەپس کراون و دەستبەسەر شتومەکەکانیاندا گیراوە و کتێبەکانیان سووتێنراوە، تەنها لەبەر تووشبوونیان بە شتێك لەوانەی باسمان کرد.

لەپێشەوەی ئەو زانایانە هەرچوار پێشەواکەی مەزهەب. من لە سەرگوزشتەی ژیانی

یەکێك لە زانایان خوێندومەتەوە نووسراوە: "لە کۆتا ڕۆژەکانی ژیانیدا بە تۆمەتی ئیجتیهادکردن حەپس کراوە"(١).

بۆیە شتێکی سەیر نییە کە شێخولئیسلام ئیبنو تەیمیە تووشی حەپسکردن بووبێت لەسەر فەتواکانی، سەیر نییە کە بە حەپسکراوی بمرێت و لە حەپسەوە جەنازەکەی بۆ گۆڕستان بەڕێ بخرێ(٢).

## ئیسلامێتیی زانست

پێش ئەوەی پەیوەندیی شێخولئیسلام بە ئیسلامبوونی زانستەکانەوە ڕوون بکەینەوە، حەز دەکەین چییەتی "ئیسلامبوونی زانست" و حەقیقەتەکەی ڕوون بکەینەوە.

"ئیسلامێتیی زانست" ـ بە بۆچوونی من ـ لایەنی تیۆریی لە ئیسلام پێکدێنێت، یاخود لایەنی مەعریفیی کە بەرامبەر لایەنی تیۆرییە لە غەیری ئیسلامدا، ئەم لایەنە لە بابەتەکانیدا باسی "تێفکرین" دەکات، کە یەکەم واجبە لەسەر ئینسان و یەکەم داواکارییە بە کۆدەنگیی موتەکەللیمین و فەیلەسوفەکان، چونکە ئەم "تێفکرین"ە سەرەتاییە بۆ مرۆڤ پێویستە بۆ ناسینی خۆی و بوونی خۆی لەلای فەیلەسوفەکان، پێویست و واجبێکی حەتمیە لەلای موتەکەلمین بۆ ناسینی خوا، کاتێك ئەم زانینەی مرۆڤ بە خۆی و دروستکراوەکەی دروست دەبێت، ئەو کاتە واپێویست دەکات لەسەر

---

(١) بڕوانە: البدر الطالع في تراجم علماء القرن التاسع، چاپی قاهیرە، لە چەند شوێنێك باسی ئەم بابەتە دەکات.

(٢) لە ٢٠ ی شەوالی ساڵی ٧٢٨هـ گیرا لە دیمەشق، لە دوای ئەوەی تووشی نەخۆشییەك بوو لە حەپسدا لە دیمەشق، زۆر مۆڵەتی نەدا، لەدوای ئەوەی لێخۆشبوونی خۆی ڕاگەیاند، ڕەحمەتی خوای لێبێت بۆ ئەوانەی حەپسیان کردووە و بەهانەی بۆ هێنانەوە، وەفاتی کرد و هەموو خەڵکی دیمەشق هاتنەدەر بۆ ماڵئاوایی کردن لێی بۆ مەنزڵگا نوێیەکەی.

مرۆڤ شتی دیکە فێر ببێت کە خۆی دەبینێتەوە لە وەڵامی پرسیارگەلێك کە پێویستە وەڵام بدرێنەوە لە بارەی سەرچاوەکانی مەعریفە و ئەو شتانەی پەیوەندییان بە مەعریفەوە هەیە، جۆرەکانی و تیۆرەکانی و بنەماکانی و پرۆگرامەکانی و وەسیلەکانی و ئامانج و مەبەستەکانی و ڕێگەی وەگەڕخستن و بەکارهێنانی و سوودلێوەرگرتنی و چۆنیەتی گردبوونەوە و کۆکردنەوەی و گواستنەوەی و خوێندنەوەی و نووسینەوەی و فێربوونی و فێرکردنی و تاقیکردنەوەی و بڵاوکردنەوەی و مێژووەکەی و پەیوەستکردنی بە ڕاستییەکان و سوننەتەکانی کەونەوە، چەندین شتی دیکەیش کە پەیوەندیی نزیك، یان دووریان هەیە پێوەی کە لە ڕێگەی فیترەتی مرۆڤەکانەوە پاڵنەرێك دروست دەکات کە بەرگریی لێناکرێت بۆ دۆزینەوەی پەیوەندییەکان لە نێوان شتە هەستپێکراوەکاندا لەلایەك و لە نێوان ئەوان و شتەکانی دیکەدا لەلایەکی دیکەوە، ئەمەش لەلای ئەوانەی ئیمانیان هێناوە کارەکەی ئاسانە، چونکە تەنها بەوەی کە خۆناسین و خواناسین لەلایان دروست بوو، ڕاستەوخۆ نیشانەکانی ئەوەی کە لەم چەرخەی خۆماندا ناسراوە بە "تیۆری مەعریفەت" و سەرچاوەکانی، دەست دەکەن بە دروست بوون و دامەزراندن، پاشان ئەو شتانەیان لا ڕوون دەبێتەوە و ئاشکرا دەبێت کە دەکرێ بە شتە چەسپاوەکانی پێش پەیڕەو (منهج) ناوزەد بکرێن، پاشان ئەو تێڕوانینانەی کە دەکرێ هەندێك بنەمای نموونەی مەعریفی بەتایبەت تێڕوانینی کەون و مرۆڤ و ژیان و دوستکەر و هەریەکە لەمانە، پەیوەندیی نێوان ئەم سێ لایەنە دروستکراوە لەگەڵ دروستکەرەکەیان، بەمە ئەوە دێتە کایەوە کە دەکرێت بە بەردی بناغەی زانست و مەعریفەی دابنێین کە ڕاوەستاوە لەسەر دۆزینەوە و دیاریکردنی پەیوەندیی لە نێوان خوای کەون و مرۆڤ، ئەمەش تێڕوانینێکە بنەماکانی جێگیر بووە لە سروشتی مرۆڤدا، مرۆڤ جێگیر نابێت بەبێ گەیشتن پێی، جا ئەم تێڕوانینە هەڵەبێت، یان ڕاست، حەق بێت، یان بەتاڵ و ڕێگەی گەیشتن پێی هەرچۆنێك بێت.

پاشان ـ لە دوای ئەوە ـ ڕوونکردنەوەی چۆنێتی بیستن و بینین و ناواخنی وەك چەند ئامراز و هۆکارێك بۆ زانست و مەعرفە و هەستکردن دەست پێدەکات.

لە چیرۆکی ئادەم باوکی مرۆڤایەتیدا، خوای گەورە ئادەمی دروست کرد و ناوی هەموو شتەکانی فێر کرد و خێزانەکەی بۆ دروست کرد و فێری کردن کە چۆن باوەڕ بێنن پێی، تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای، ئەمەش پەیڕەوێکە لەو پەیڕەوانەی کە پیادە کراوە لە ناساندی ئەم شتانە بە مرۆڤ و فێرکردنی یاسا و ڕێساکانی.

جاری واش هەیە ئیمان و ئەوەی بەدوایدا دێت لە تێڕوانینەکان پەیدا دەبن لە ئەنجامی کرداری لاکردنەوەیەکی عەقڵی سروشتی لە واقعەوە بەلای پەنهان (غیب)دا بەبێ فێرکردنی خوایی ڕاستەوخۆ، وەك ئەوەی ڕوویدا لە گەورەمان پێغەمبەر ئیبراهیم کاتێك کە گەیشتە ناسینی خوا بە تێڕوانین لە دروستکراوەکان: ئەوەبوو دەستی کرد بە ناسینی یەکەم، یان بڵێین یەکەم ناسین بەوەی کە گەڕا بە دوای گرنگترین ئافەریدە (کائن) کە کاریگەریی لەسەر عەقڵی مرۆڤی زیندوو ببێت و وای لێبکات بەخوای خۆی بزانێ، لەوانە سەیرکردنی بۆ ئەستێرە درەوشاوەکان کە دیارنەمانیان گرێدەدات بە شایستەنەبوونیان بۆ خوایەتی و ئەو کەموکورتییانەیان بەڵگەیەکی ئاشکرا پێکدێنن لەسەر ئەوەی کە پێویستیان بە جگە لە خۆیان هەیە و پێویستیان بە بەڕێوەبەرێك هەیە لە دەرەوەی خۆیان کە سەرپەرشتییان بکات لە حاڵەتەکانی دەرکەوتن و گەورەبوون و درەوشاویی و پاشان بچووکبوونەوەیان و ون بوونیان، بۆیە ئیبراهیم پێغەمبەر هۆشمەندیی بۆ هات لە دوای خوێندنەوەیەکی کەون و مەسەلەی دروستبوونی بوونەوەر و پێویستیی بوونی دروستکەرێکی دوور لە هەموو سیفەتێکی کورت و کوێرانە، پەیوەست بوونیشی بە هەموو سیفەتێکی تەواو و کامڵ، کە لە دوای ئەوە گەیشتە مەبەستی خوای گەورە لە دروستکردنی بوونەوەر و ڕووی کردە دروستکەری ئاسمانەکان و زەوی، بە پاکیی و موسڵمانێتی، لەوانە نەبوو کە هاوەڵ بۆ خوا قەرار دەدەن، لەو خوێنەرە کەونییە کورتبینانە نەبوو کە پێش تەواوبوونی خوێندنەوەکەیان پاشگەز دەبنەوە، بۆیە دەتوانین بڵێین بە چیرۆکی گەورەمان ئیبراهیم پێغەمبەر، بنیاتنانی فیتریی عەقڵیی دەروونیی ڕاست و دروست دەست پێدەکات و دێتە کایەوە بۆ بنیاتنانی تەلاری مەعریفیی لەسەری.

# پێغەمبەرایەتیی

دوای بنیادنانی ئەو بنەما زانیارییە ـ لە ڕووی تێڕوانینی ئیمانییەوە ـ بەرنامەی خوێندنەوە دەستپێدەکات لەسەر دەستی نێردراو و پەیامبەرانی پشت بەست بە (موعجزە) و بونیادی بنەما زانیارییەکان تەواو دەبێت و بنچینەی شەریعەت و هەموو ئەو بەرنامانەی مرۆڤایەتیی پێویستی پێیانە، دادەمەزرێن، تا مرۆڤ زانیارییەکانی تەواو و بێ کەموکورتی بێت و تواناکانی گەشە بکات بەسەر خوێندنەوەی بۆ سرووش و گەردوون، بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت هەستێ بە جێبەجێکردنی کارەکانی لە جێنشینی و ئاوەدانکردنەوەی زەوی و هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتەی پێی سپێردراوە.

لێرەدا مرۆڤ پێویستی نییە بە تێکۆشان و ئەفسانەکەی (برومپیوس) ـ ئاگردز لە گەورەی خوداکان ـ[1] وەك یۆنانییەکان و میراتگری کەلەپورەکەیان بڕوایان پێی بوو،

[1] ئەفسانەی برمپیوس ئەو ئەفسانەیەیە کە یۆنانییەکان باوەڕیان پێیەتی، کورتەی ئەفسانەکە ئەوەیە کە: برمپیوس، ئەو خوا چاکەیە بە فەرمانی خوا گەورەکەی (زیوس) دەستی کرد بە دروستکردنی بوونەوەرەکان و توانی هەموویان دروست بکات بەو شێوەیەی کە پێویستە و تایبەتمەندییەکانی بۆ دروستکردن، کاتێك کە هاتە سەر دروستکردنی مرۆڤ، هیچ صیفەت و تایبەتمەندییەکی بۆ نەدۆزرایەوە تەنها صیفەت و تایبەتمەندییەکانی خواکان نەبێت، بۆیە لەسەر شێوەی خوایەکان دروستی کرد، بەمە خوا گەورەکەی ڕقی لێداگرت، مرۆڤی بێبەش کرد لە ئاگر و لێی قەدەغەکردن بۆ ئەوەی نەتوانن وەك خواکان نوێگەریی و شت دروست بکەن و مەعریفە بزانن، لەبەر ئەوەی برمپیوس مرۆڤی خۆش دەویست، هەستا بەدزینی ئاگر بۆ مرۆڤ بۆ ئەوەی بەکاری بێنن و کاری خواکانی پێ ئەنجام بدەن، بۆیە بەهۆیەوە توانییان فێری زۆر شت بن، لەوانە: زانستی فەلەك و نووسین و.. هتد ئەم کارە تووڕەیی (زیوس)ی گەورە خوای بەتەوای هەڵساند، بۆیە کاتێك کە برمپیوس قوربانیی ئەنجام دا بۆی بەهانەی پێگرت و قوربانییەکانی بە کەم و نابوت وەسف کرد، بۆیە هەستا بە سزادانی و لە نێوان دوو شاخدا بەستیەوە و ئەژدیهایەکی ڕاسپارد کە بە ڕۆژ جگەرەکەی بخوات و ئەمیش بە شەو بۆی دروست دەکردەوە.. هەتا یەکێك لە هاوڕێکانی رزگاری دەکات.. هتد. جا نووسەر دەیەوێ بڵێت، ئێمەی مسوڵمان پێویستیمان بەم جۆرە ئەفسانانە نییە بۆ زانینی سەرەتای دروستبوونی مەعریفەت. وەرگێڕ.

چونکه خودای تاکی تەنیای داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی سرووش دەکات بە زانیاریی و پەیامبەران هەڵدەبژێرێت لە نێو مرۆڤ و فریشتەدا بۆ گەیاندنی بە مرۆڤەکان، پاشان نێردراوانی خودا بۆ لای مرۆڤ بە بەردەوامیی و بەدوای یەکدا دێن بۆ ناساندنیان بە دروستکەری گەردوون و ژیان، فێریشیان دەکەن کە چۆن ئەوەی خودا سرووشی بۆ کردوون بخوێننەوە و پێی ئاشنا ببن و لە لایەن خوداوە هەواڵیان پێدەدەن بەوەی پێویستیان پێیەتی، هاوکات ئاشنایان دەکەن بەو شتانەی کە بەهۆیەوە دەتوانن جێنیشینێکی باشتری خوایی بن، بۆ ئەوەی ڕزگاریان بکەن لە تاریکیی ئەو بیرکردنەوە دەروونییانەی بۆ مرۆڤ دروست دەبن و بە دڵیاندا دێت (التصورات الإيحائية– الأنيمية) کە هانیان دەدات لە بەخودا سەیرکردنی دیاردەی سروشتیی و هەسارەکان، بە جۆرێك کە خوداکان لەلایان جۆراوجۆر دەبن بە ژمارە و جۆری دیاردە سروشتییەکان، عەقڵی مرۆڤ گەر وازی لێبهێنرێت و سرووشی پێنەگات و خودا نێردراوی خۆی بۆ نەنێرێت، ناتوانێت لە تاریکی ئەو بیرکردنەوە دەروونییانە ڕزگاری بێت، ئەگەر لەو تاریکییەش دەرچێت پێش دەکەوێت بۆ ئاستێك کە زۆر لەو ئاستەوە دوور نییە، ئەویش ئەو ئاستەیە کە جۆرە پەیوەندییەك دروست دەکات لە نێوان ئەو خودایانەدا کە بە بیرکردنەوەی خۆی هەندێکیان بوون بە خواوەندی گەورە و هەندێکیان خواوەندی بچووك و پەیوەندییان لە نێواندایە وەك پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان، بۆیە ئەو خوایانە دەکرێ کێشە و جیاوازییان ببێت و شەڕ بکەن و ئاشت ببنەوە، ئەگەر عەقڵی مرۆڤ هەنگاوێکی دیکە پێشبکەوێت دەتوانێ بگاتە ئەوەی بیر لە خودایەکی تاك بکاتەوە، بەڵام سەری لێدەشێوێ و دەیبینێتەوە لەهەر دیاردەیەکی گرنگ لە دیاردە سروشتییە سەربەخۆکان، ئەگەر لەوە زیاتر پێشبکەوێت بیر دەکاتەوە لەوەی خودایەتی تاکە، بەڵام دیسانەوە سەری لێدەشێوێت و لە گەردوون و تاکیەتی بوون (وحده الوجود)دا دەیبینێتەوە.

ئەگەر پەیامبەرایەتی ڕێنموونیی مرۆڤ نەکات، لە کۆتاییدا دەگاتە بیرکردنەوەیەکی سروشتیی کە دان نانێت بە هەبوونی هێزێك لە سروشتدا، نکوڵیی دەکات لە هەبوونی

هێزێکی کارتێکەر لە دەرەوەی سروشت، تا وای لێدێت سروشت دەبێتە خودا و پەرستراوی مرۆڤ، ئەگەر دان بە بوونی خودایەکیشدا بنێ لە دەرەوەی سروشت، ئەوە خودایەکە کە تەنیا هێزێکی سەرەتایی بەخشیوە بە بوونەوەر و ئەرکی ئەو خودایە لەو ئاستەدا کۆتایی پێهاتووە، وەك چۆن هەندێك لە فەیلەسوفەکان ئەم ڕایەیان هەیە[1].

بۆیە لێرەوە "پەیامبەرایەتی" پێویستییەکە کە دەبوو هەبێت، گەرنا مرۆڤ لەم سەر لێشێواوییەدا دەمایەوە و لە نێوان ئەو ئاستانەدا ئەملا و ئەولای دەکرد کە بەوپەڕی توانای بیرکردنەوەی عەقڵی خۆی پێی دەگەیشت.

هەربۆیە شێخولئیسلام ئیبنو تەیمیە گرنگی شیاو و بەرچاوی بە بابەتی پەیامبەرایەتیی داوە، لەم بوارەدا کتێبی ناوداری (النبوات ـ پەیامبەرایەتیی) ئامادە کردووە تا لە ڕێگەیەوە پێویستیی و گرنگیی پەیامبەرایەتی و خاسیەتەکانی ڕوون بکاتەوە، ئەو پەیامەی کە لە ڕێگەی سرووشەوە دەیهێنێت بۆ ڕێنموویيکردنی مرۆڤەکان و ئامادەکردنیان بۆ هەستان بە ئەرکی جێنشینی لە زەویدا، گشت بەخشین و پێدانەکانی عەقڵ لە فەلسەفە و زانیارییەکانی دیکە مرۆڤ بێنیاز ناکات لە "پەیامبەرایەتی" پەیامەکەیان، بەم جۆرە سرووش سەرچاوەیەکی سەرەکیی و ڕەسەن تەرخان دەکات بۆ زانست و مەعرفە، مرۆڤ سەری لێدەشێوێت گەر نەیکات بە ڕێنوێن، یاخود کێشە و ناکۆکیی هەبێت لە دانانی بە سەرچاوە و بەڵگە.

کاتێك مرۆڤ گەیشتە ئەم ئاستە پەیوەندیی نێوان گەردوون و خودا لە لایەك و خوداو مرۆڤ و مرۆڤ و گەردوونی بە ڕوونیی و وردیی بۆ دیاری دەبێت، ئەمەش بەردی بناغەی هەموو زانیارییەکانە، چونکە دیارییکردنی پەیوەندیی نێوان خودا و گەردوون عەقڵی مرۆڤ لە هەموو خەیاڵێکی گومڕایی و سەرلێشێواویی، وەك بەخودا سەیرکردنی بوونەوەران، دادەماڵێت، ڕێگە واڵا دەکات کە مرۆڤ ئەو ئامێر و هۆیە زانیارییانەی کە خودا پێی داوە بەکاری بێنێت، خوای گەورە دەفەرموێ: (وَاللّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئاً وَجَعَلَ لَكُمُ الْسَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ) (النحل:

---

[1] (ئەرستۆ) یەکێك بوو لەوانەی ئەم بۆچوونەی هەبوو.

٧٨). واتە: خودا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە هیچتان نەدەزانی، ئامێری بیستن و بینین و دڵ و دەروونی بۆ دابین کردوون ـ کە ئامرازی تێگەیشتنن ـ، بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن".

هەروەها مرۆڤ دڵەڕاوکێ و نائارامیی دەوروپشتی لێ جیا دەبێتەوە و ئەوەی بۆ دەستەبەر دەبێت کە دەکرێ ناوی بنێین بە "ئاسایشی مەعریفی"، خوای گەورە دەفەرموێ: (الَّذِينَ آمَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللّهِ أَلاَ بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ) (الرعد: ٢٨) واتە: "ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە و دڵیان ئارام دەبێت بە یادی خوا، ئاگادار بن و بزانن بەیادی خوا دڵەکان ئارام دەبن، هەروەها دەفەرموێ: (الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَـئِكَ لَهُمُ الأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ) (الأنعام: ٨٢) واتە: "ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و ستەم و هاوەڵگەرییان تێکەڵی ئیمانەکەیان نەکردووە، ئاسوودەیی و بێ ترسی لە سزا، بۆ ئەوانەیە، ئەوانەن ڕێنومایی کراون بۆ ڕێگای ڕاست..

مرۆڤ دەزانێت کە ئەم گەردوونە ڕام کراوە بە ڕێباز و یاسا گەردوونییە خوداییەکان کەوا دەخوازن ئەو ببێتە جێنشین تیایدا، ئەم تایبەتمەندی جێنشینییەش وابەستەیە بە خودای پەروەردگارەوە لە بوون و ڕۆڵی مرۆڤ تیایدا، ئەم گەردوونە ماڵ و جێگەیەتی لەم ژیانەدا، بۆیە پێویستە لەسەری ئاوەدانی بکاتەوە و چاودێریی بکات و پارێزگاریی لەوانەش بکات کە تێیادان و ڕەوایەتی و دادپەروەریش لە نێویاندا بەرقەرار بکات بۆ ئەوەی بەندایەتی بۆ خودا بە مانا گشتگیرەکەی جێبەجێ بکات و پەیوەندیی تەواو لە نێوان دروست بوون و مەبەست لە دروست بوون بزانێت، ئەگەری هەموو ئەو بیرۆکە لێکدراوانەی باس لە نەبوونی خودا، یان دروست بوونی بێ هۆ و مەبەستی بوونەوەری، بۆ دروست نەبێت: (أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ) (المؤمنون: ١١٥) واتە: ئایا ئێوە وا گومانتان دەبرد کە ئێمە ئێوەمان بێ مەبەست دروست کردووە و ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ لامان؟!

کاتێك بەدواداچوون دەکەین بۆ هەڵسوکەوتی پەیامبەران، دەبینین هەموویان کاریان کردووە بۆ سەرکردایەتی مرۆڤ و ئاڕاستەکردنی هەنگاوەکانی لەم جیهانەدا، ئەویش بە

گەیاندنی ئەو پەیامەی بۆیان دابەزیوە و فێرکردنی مرۆڤ بە ژیریی و دانایی و پاککردنەوەی دڵ و دەروونیان، هەموو ئەمانەش بۆ ئەوەی مرۆڤ بزانێت ئەرکەکانی چییە و چۆن جێبەجێیان دەکات، ئەو کاتەی مرۆڤ کامڵ و ئامادە بوو بۆ وەرگرتنی بەرنامەی تەواو و گشتگیر، خوای گەورە دواین پەیامبەری خۆی (حەزرەتی موحەممەد ـ دروودی خوای لێبێت) نارد بۆ ئەوەی ببێتە کۆتایی پەیامبەران و کۆتا خشت لەو تەلارە تەواو و بێکەموکورییە، وەك خۆی دەفەرموێ: (إِنَّ مَثَلِي وَمَثَلَ الْأَنْبِيَاءِ من قَبْلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بَيْتًا فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَهُ إلا مَوْضِعَ لَبِنَةٍ من زَاوِيَةٍ فَجَعَلَ الناس يَطُوفُونَ بِهِ وَيَعْجَبُونَ له وَيَقُولُونَ هَلَّا وُضِعَتْ هذه اللَّبِنَةُ قال فَأَنَا اللَّبِنَةُ وأنا خَاتِمُ النَّبِيِّينَ)[1]، واتە: " نموونەی من و پەیامبەرانی پێش من، وەك نموونەی کەسێك وایە ماڵێك دروست بکات بە باشترین و جوانترین شێوە، تەنیا شوێنی خشتێك نەبێت لە گۆشەیەکدا، خەڵکی بە دەوریدا بگەڕێن و لایان سەرنجڕاکێش بێت و بڵێن: "خۆزگە ئەو خشتەیش دانرابا، من ئەو خشتەم و من کۆتایی پەیامبەرانم".

قورئانی گەورەی بۆ دابەزاند تا هاوتای بوونی گەردوون و جموجوڵەکەی بێت، قورئان بەڵگەی ڕوون و ئاشکرایە، گەردوونیش بوونەوەر و دیاردە و ڕێبازی کاریگەر و فەرمانڕەوان، قورئان پەیام و کەلەپوری پەیامبەرانی پێشووی گێڕاوەیەوە و گەورەتر و داگرندەبوو بۆ هەموو پەیامەکانیان، هەموو دەستکاریی و زیادەڕەوییەك و دەستتێوەردان و سەرلێشێواندن و ناڕۆشنییەکی لەو پەیامانەدا ڕەتکردەوە، قورئانی پیرۆزیش پشتڕاستکەرەوەی پەیامی پەیامبەرانی پێشووە لە ڕێگەی گێڕانەوە و دابەزاندنیەوە بە کۆتایی پەیامبەراندا و تۆکمە و تەواوکردنی پەیام و ڕێبازەکەی،

---

[1] ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەی دا بەشی کۆتایی پەیامبەران (ج٣ ص ١٣٠٠) بە ژمارە (٣٣٤٢) گێڕاویەتیەوە، هەروەها ئیمامی مسلم لە صەحیحەکەیدا بەشی کۆتایی پەیامبەران (ج٤ ص ١٧٩١) گێڕاویەتیەوە.

مەبەست لەم فەرموودە ئەوەیە کە خوای گەورە پەیامبەرانی بە جوانترین پەیام و بەرنامە ناردووە و حەزرەتی موحەممەدیش (دروودی خودای لەسەر بێت) تەواوکەری ئەو بەرنامە جوانەیە.

ڕێکخستنەوەی ئەو پەیامانەیە لە چوارچێوەی پرۆگرامێك کە شیاوی نوێبوونەوەیە لە ڕێگەی هۆشیاریی مرۆڤەوە کە خۆی دەبینێتەوە لە زانایانی نوێگەر، بە جۆرێك کە مرۆڤایەتیی پێویستی بە پەیامبەرانی نوێ نابێت.

## بەرنامەی کۆکردنەوە لەنێوان دوو خوێندنەوەکەدا

قورئانی پیرۆز ئایەتەکانی بە فەرمان بە خوێندنەوە دەست پێکرد، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی شێوازی خوێندنەوەی داواکراو کە خۆی دەبینێتەوە لە کۆکردنەوە لە نێوان دوو خوێندنەوەدا، خوێندنەوەی قورئانی مەزن و خوێندنەوەی گەردوونی پان و بەرین، ئەم دوانە دوو پەڕتووکن: پەڕتووکێکی دابەزێنراو و خوێنراو، سەرسوڕهێن، کە خوێندنەوەی ئایەتەکانی بە خواپەرستیی دەژمێردرێت، ئەم پەڕتووکەش کە بریتیە لەو قورئانەی ئایەتەکانی بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و پتەو پێکەوە پەیوەست کراون، پاشان لە لایەن زاتێکەوە کە داناو بە ئاگایە، ڕوون کراونەتەوە.

ئەو قورئانە سەرچاوەی دانایی و ڕێنوێنی و پاککردنەوە و ئاوەدانیی و ژیارییە و مەبەست لە بوون دیاری دەکات، پەڕتوکی دووەم پەڕتووکێکی دروستکراو و کراوە کە بیناکەی پتەو کراوەو یاساو دیاردەکانی پەیوەست کراوە و لە هەموو لایەکیەوە شوێنەواری توانای پەروەردگاری پێوە دیارە تا ببێتە گۆڕەپانی کاری ژیاری مرۆڤ: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ * خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ * اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ * الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ * عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ) العلق: ١ ـ ٥، واتە: بخوێنە بە ناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە بەدیهێنەری دروستکراوەکانە، ئادەمیزادی لە پارچە خوێنێك "چەند خانەیەکی هەڵواسراو لە ناو منداڵداندا" دروست کردووە، بخوێنە و پەروەردگارت بەخشندەیە، ئەو زاتەیە کە بە هۆی قەڵەمەوە زانست و زانیاریی فێرکرد، مرۆڤی فێری ئەو شتانە کردووە کە پێشتر نەیزانیوە.

لەبەر ئەوە کۆکردنەوە لە نێوان ئەم دوو خوێندنەوەیە[1] بەردی گۆشەیە لە بەرنامەی زانستی ئەو گەلەی بۆ هەموو گەلان هاتۆتە مەیدان و نموونە و شایەتە بە سەریانەوە، کاتێك مرۆڤ تەنیا یەك خوێندنەوەی هەبێت، ئەوە لادانێکی ترسناکە لە بەرنامەکە و کۆتاییەکی خراپ و دژواری دەبێت، دابڕانێك لە نێوان ئەو دوو خوێندنەوەدا بەدی دێت و هیچ دەروازەیەك نییە بۆ کۆکردنەوەیان، ئەو دابڕان و گرنگیدان بە یەك خوێندنەوەیە وا دەکات ئەوانەی خوێندنەوەیان هەیە تەنیا بۆ سرووش و دوور لە گەردوون تووشی لادان دەبن بۆ ڕزگاریی تاك و گوێ نادەن بەو ئەرکی ئاوەدانکردنەوەیەی پێیان سپێردراوە، هەروەك چۆن دوور و نادیار دەبن، یان دووردەخرێنەوە و ناتوانن پیادەی ئامادەبوونێکی ژیاریی بن، چونکە سرووش دەگۆڕن بۆ پەنهان (غیب) کە ناتوانرێت ڕاڤە و شیکردنەوەی بۆ بکرێت تەنیا بە شتێکی پەنهان (غیب)ی وەك خۆی نەبێت و ئەنجامەکەیشی پەیوەندیی نابێت تەنیا بەو پەنهان (غیب)ەوە نەبێت، دیدوبۆچوونیشیان جیاواز و شێواو دەبێت بۆ ئەو پەیوەندیی و ڕیشەیەی لە نێوان مرۆڤ و گەردووندا هەیە و ڕەنگە لە بۆچوون و هەژماری خۆیاندا پەروەردگاری بەدیهێنەر و پەیوەندیی سرووش پێیەوە دەربهێنن تا وای لێدێت دینداریی دەبێت بە ئاینگەرییەکی لاهوتی و قەشەیی و مرۆڤ و گەردوون لێك دادەماڵێت و هۆکار و یاساکانی جولان و هەموو ڕێبازەکانی کە لەگەڵ مرۆڤ دا کارلێك دەکەن، پشتگوێ دەخات. تا بیرکردنەوەی مرۆڤ کۆتایی دێت لە چوارچێوەیەکی داخراوی بەستوو، هەندێکجار دەیکات بە ماڵ بەسەر ئایینەوە، لە کاتێکدا ئایین لێی دوورە، هەندێکجار مرۆڤ بەرەو زیادەڕۆیی و دینداربیەکی قەشەیی ڕۆحیی دەبات کە وا دەکات لایەنی جێنشینی و ئاوەدانکردنەوە گوێ پێنەدات، بەڵام ئەوانەی تەنیا خوێندنەوەیان بۆ بوون هەبێت دوور لە خوێندنەوەی سرووش (وحی)، ئەوانە بێئاگا دەبن لە پەروەردگاری بەدیهێنەر و بابەتە نادیارەکانی کارتێکەر لە بوونەوەر، تا وایان لێدێت دان نانێن بە نادیار و پەنهانەکاندا، تێڕوانینی گشتییان بۆ بوون و مرۆڤایەتیی و ژیان

---

[1] بگەڕێوە بۆ پەراوێزی ژمارە (١٤) لەم نووسراوەدا.

لەدەست دەدەن و مرۆڤ دابەش دەبێت بەسەر خۆیدا و کێشە دروست دەبێت لە نێوان تێگەیشتن بۆ ئایین و سرووشت لە لایەك، لە نێوان جیهانی خواناسیی (اللاهوت) و جیهانی بەهەست ـ ناسوت ـ لە لایەکی دیکەوە، لە نێوان مرۆڤ و گەردوونەوە لەلای سێهەمەوە، تا وای لێدێت مرۆڤ خۆی بێ نیاز دەبینێ لە خودا و ئارەزووەکانی و سەرکێشی و ستەم دەکەن، هەندێکجار ئەم سەرکێشیە تەواوی ژیارێك دەگرێتەوە بەیەك ڕەوت، وەك ئەوەی ئێستا هەیە لە نموونەی ژیاری ڕۆژئاوادا و ئەو سەرکێشی و خۆبەگەورەزانینەیان لە زەویدا.

## عەقڵ

لەوەی کە تێپەڕی ئاماژەمان دا بەوەی کە بیر و عەقڵ بە تەنیا مرۆڤ بێ نیاز ناکەن لە ژیاندا ئەگەر ڕێنموویی وەر نەگرێت لە سرووش و نیگاوە و پەیوەندیی نێوانیان بە شێوەیەکی تەندروست ڕێکنەخات، کەواتە عەقڵ ئامێری کۆکردنەوەی نێوان ئەو دوو خوێندنەوەیەیە[1] و بێ ئەو ناتوانرێت شتێك لەوانە تەواو بکرێت، یاخود خوێندنەوەیەکی تەندروست و گشتگیر بکرێت بۆ بابەتەکان، بەهێزترین و بەتواناترین کاتی عەقڵ ئەو کاتەیە کە دوو خوێندنەوەکە کۆ دەکاتەوە و لە ئەنجام و بەرهەمی ئەو دوو خوێندنەوەیە زانیارییەك بنیاد دەنێ و خامەکانی پێ دەخاتە کارو دێڕەکانی پێ پڕ دەکاتەوە، پاشان گەلان ئەم زانیارییانە بەکار دێنن و دەستاو دەستی پێدەکەن و مرۆڤەکان ڕوونی دەکەنەوە و پەرەی پێدەدەن و پێی دەگەنە مەبەست و پێی دەپەڕنەوە لە پردی تاقیکردنەوەی خوایی بەوەی کاری چاکی پێ ئەنجام دەدەن و بە کارامەیی و وردیی کار و فەرمانەکان جێبەجێ دەکەن و بە ئەمانەتی خوایی هەڵدەستن.

---

[1] مەبەست لە خوێندنەوەی پەیامی خودا و گەردوونە، هەر وەك پێشتر باسکرا.

هەرکات مرۆڤ وا گومان ببات کە عەقڵ خۆی سەرچاوەی زانیارییە و لە ناخی خۆیدا بەرهەمی دێنێت، یاخود عەقڵ تەنیا یەك خوێندنەوە بکات، ئەوە ئەوکات بە زیانێکی زۆر دەشکێتەوە بەسەریدا، چونکە هەندێکجار عەقڵ دەبێت بە قوربانیی و نێچیری چەند جۆرە بیرکردنەوەیەك و خەتەرە و خەیاڵێك کە بەدوای یەکدا دێن بێ بەرهەم و وای لێدەکات سەرسام دەبێت لە دونیای بیرکردنەوە و خەیاڵ و ئەگەر و گریمانەکاندا، بێئەوەی جێگیری و ئۆقرەیی ببینێت و هەر پرسیارێك کە دەیوروژێنێت، لە بەرامبەریدا وەڵامی نابێ، بەڵکو پرسیارێك، یان کۆمەڵە پرسیارێکی دیکەی یەك بە دوای یەکی بێ ئەنجامی ڕووبەڕوو دەبێتەوە کە هەریەکیان چەند پرسیار بەدوای خۆیاندا دێنن و لەو بازنەدیەدا دەخولێتەوە بەبێ ئەنجام.

ئەگەر عەقڵ یەك خوێندنەوەی کرد و هەردوو خوێندنەوەکانی کۆنەکردەوە، ئەوە دەگاتە ئەو ئەنجامە تاکڕەو و دابڕاوانەی ئاماژەمان پێدا، ئەوەی بەدواداچوون بۆ جوڵانەوە هزرییەکانی کۆن و نوێی مرۆڤ بکات نموونەی زۆری دەست دەکەوێت لەوەی باسمان کرد لە تەواوی قۆناغ و پلەکان، لە شارستانیەت و ڕۆشنبیرییە ڕابردوو هاوچەرخەکاندا.

ڕەنگە بتوانین ئەوەی ڕابورد کورت بکەینەوە بەوەی کە ئیسلام بوونی زانست لەم شێوەیەیدا واتای ئەوە نییە کە پۆشاکێکی ئایینی بکەینە بەری زانیارییە مرۆڤایەتییە جۆراوجۆرەکان، یاخود بەدیهێنانی هاوتایەك بێت بۆ هەموو ئەو شتانەی کە هەن لە بووندا، بەڵکو واتای هەوڵدانێکی تەواوە لە بازنەی کۆکردنەوە لە نێوان دوو خوێندنەوەکەدا بۆ ئاشکراکردنی "ڕێبازێکی زانستی" کە بە توانایە لە ڕزگارکردنی مرۆڤی هاوچەرخ لەم تەنگەژە گشتگیرەی شارستانیەت، کە مرۆڤایەتیی خستۆتە ژێر گوشاری خۆیەوە بێ لەبەرچاوگرتنی ڕووەکانی کەموکوڕییەکان و شێوەکانی، کەوابوو ناوەندێتی ڕۆژئاوای هاوچەرخ بە خوێندنەوە کوێرانەکەی خۆی جیهانی ڕاکێشاوەتە ناو حاڵەتێکی واوە کە ناتوانێ خۆی لێ جیا بکاتەوە، مارکسییەت هەوڵیدا هەستێ بە کاری فریادڕەسی فەلسەفیی بۆ ئەو حاڵەتەی ڕۆژئاوا لە چوارچێوەی "بێژیارێتی بەجێ

و بەڵگەدار (الديالیكتيك)" و ئەو گەڕاندنەوە و كۆتاييە فەلسەفييانەی دروستی كردبوون لە چوارچێوەی ئەو يەك خوێندنەوە تاكڕەوييانەی كورت هەڵهاتوانە لەسەر بوون (الوجود) بە تەنها، ئەوەبوو بەو شێوە ترسناكە كەوت و ڕما تا شارستانيەتی ڕۆژئاوا جێبهێڵێ بناڵێنێت بە تەنگەژەكانيەوە لەگەڵ ئەو تەنگەژانەی پێش ماركسييەتيش كە هەی بوون، ئەو تەنگەژە شارستانييانەی كە كاردانەوەيان هەبوو لەسەر لايەنەكانی ژيانی كۆمەڵايەتيی و ڕەفتاری و ئابووريی، ئەمانە چەند قەيرانێكن كە ئيدی ئەو چارەسەرە كەموكورتانەی ناوەندەكانی لێكۆڵينەوە و توێژينەوە نوێكانی ڕۆژئاوا پێشكەشی دەكەن، بێ سوودە لە چارەسەركردنيان.

لە چوارچێوەی ئەم تێكەڵبوونی شارستانييەتانە، يان زاڵبوونی شارستانييەت لە ناوەندی ڕۆژئاواوە بەسەر هەموو بەشەكانی ديكەی دونيادا، دروستبوونی ئەو ناوەندييەتە لەسەر بنەمای شوێنكەوتوويی و بەديهێنانی توانای شوێنكەوتوويی لە لايەن گەلانی ديكەوە، بەنيسبەت گەلانی مسوڵمانەوە ـ بەتايبەت ـ، گرفتەكە دەبێتە دوولايەنە، ئەو گەلە مسوڵمانەی قبوڵكردنی تەواو، يان ناتەواوی شوێنكەوتوويی سەركردە و فەرمانڕەوا و زۆرێك لە دامەزراوەكانيان بۆ بەرنامە و بيروبۆچوونی ڕۆژئاوا تكای بۆ نەكردون لەلايان، كەچی لەولاوە ناوەندی ڕۆژئاوا ئيسلام وەك دوژمنێكی بەديل سەير دەكات و بەرپرسيارێتی گرفتەكانيانی دەخاتە ئەستۆ، لە هەوڵێكدا كە لە هەوڵی سەرخۆشێكی بێئاگا دەچێ كە هەموو هەوڵێكی ئەوەيە كە بەهۆش خۆی نەيەتەوە بۆ بينينی ڕاستييەكان ـ ڕاستی گرفتەكەی ـ، چونكە لە ڕاستيدا توانای بينينی ئەو هەموو تاڵييانەی نييە كە خۆی دەبينێتەوە لە بەرپرسيارێتی هەموو ئەوانەی ڕوودەدەن كە بەردەوام پێدادەگرێت و داوای گۆڕينی ئارەزوو و بۆچوونەكانی بير و هۆش و ئەو ڕێبازانەی لە ژيانيدايە، لێدەكات، ڕەجا وايە خودا حاڵی بگۆڕێ دوای ئەوە و يارمەتيی بدات لە دەربازبوونی لەو گرفت و تەنگژانە.

بێگومان جيهانييبوونی تەنگەژەكان پێويستيان بە جيهانييبوونی چارەسەرەكانە، بۆ ئەوەی چارەسەرە ئيسلامييەكە لە ئاستی گوتاری جيهاندا بێت، ئەوە دەروازەی

سەرەكیی بریتییە لە (بە بەرنامەبوونی زانستی) كە دەبێت لەسەر قورئانی پیرۆز بەندبێت، چونكە ئەوە بە تەنها دەتوانێ عەقڵی سەردەم ڕێكبخاتەوە و بونیادێكی تەندروستیی هەستەكانی بكات، بەڵام مەبەستمان بە "بەرنامەبوون ـ المنهجیە" كۆمەڵە ڕێكخەرێكە بۆ بیری مرۆڤ كە هەڵدەهێنجرێت لە چوارچێوەی سەرچاوە و پێداچوونەوەی گونجاو هەڵبستیان بە دیاریكردنی ڕێگەكانی بەرهەمهێنانی بیر و وەگەڕخستن و تاقیكردنەوەیان، چونكە بە بەرنامەبوون (المنهجیة) عەقڵی مرۆڤ دەردێنێت لە دۆخی دروستكردن، وەگەڕخستنی بیر و بۆچوونەكان لە لایەن خودی مرۆڤەوە دروست دەبن، پشت دەبەستن بە لێوردبوونەوە و بۆ هاتنی خەیاڵی هەڵقوڵاوی خود، هەروەها هانی دەدات بۆ دۆخی دۆزینەوەی (بازنەیەكی شوێنگەڕانەوەیی ـ مرجعی) كە دەگەڕێتەوە بۆ لای لە ڕێگەی بەرنامەیەك كە خۆی دەبینێتەوە لە كورتەی چەند یاسا و ڕێبازێك كە تێبینی كراوە و بە هەند وەرگیراوە و پاشان، گۆڕاوە بۆ چەند بیردۆز و بنەمایەك، تا وای لێدێت ئەو شێوازی ڕێكخەری ئەم بیردۆزانە دەبێت بە بازنەیەكی سەرچاوەیی شوێنگەڕانەوەیی، جموجوڵەكانی ڕێكدەخات بە جۆرێك دژایەتیی و ناڕێكیی و پێكدادانی تێدا نییە، ئینجا بیرەكان دەكرێنەوە و فراوان دەبن لە دەوری ئەم بازنەیە، پاشان دەگەڕێنەوە بۆ لای، وەك ئەوەی بەسترابنەوە پێوەی بە پاشبەندێك.

لەبەر ئەمە بەرنامەبوون (المنهجیة) زیاد لەو ئەركەی، دەشبێتە ڕێكخەری بیروبۆچوون و بیردۆزەكان و گونجێنەری یاساكان، بە شێوەیەك دەیانبەستێتەوە پێكەوە و پەل دەكێشێتە ناو دارشتنی پرسیار و گریمانەكان، هەروەها بۆ ئەوەی دواتر بگات بەو "مەعریفیەتەی" كە هەڵوێستە دەكات لەسەر هەر ڕووداو و بابەتێك بە هەڵوێستێكی توێژەریی و ڕەخنگریی و شیتەڵكاریی، پاشان دووبارە بەستن و ڕێكخستنەوەی، كەوابوو بە بەرنامە بوون (المنهجیة) زانستی ڕوونكردنەوەی ڕێگاكان و هەنگاوە پێویستەكانە بۆ پەڕینەوە و بڕینی بە ئاڕاستەی ئامانجێكی زانستیی دیارییكراو، "تێگەیشتنەكانیش" بریتین لەو خشتە بنەڕەتییانەی كە بە بەرنامە بوون

لەسەری ڕاوەستاوە، هەروەك بریتییە لە "بازنەیەکی شوێنگەڕانەوە ـ مرجعی" ڕێکخەر کە ڕێگەخۆشکەر و ئاسانکەری دانانی بیرۆکەکانە لە شوێنی خۆیان و کار دەکات بۆ بونیاتنان و بەکارهێنانیان بە شێوەیەك کە مەبەستی مەعریفی لێیان بەدیبهێنرێت، کاتێکیش "بازنە شوێنگەڕانەوە (مرجعی)یەکە" بریتی بێت لە ڕێکخەری بیرۆکە و تێگەیشتنەکان، ئەوە بێگومان دەبێت ئەم بازنەیە لەسەر چەند بنەما و ڕاگرێك ڕاوەستێ کە بیرۆکەکان گرنگترینیانە.

ئەگەر بەرنامەکان لە دیدی کەسانی دیکەوە چەندین و فرە بن و بە بەرنامە بوون جۆراوجۆر بێت بە پێی جۆراوجۆری دیدەکانیان سەبارەت بە زانیاریی و پۆلێنکردنی، یان لایەنەکانی، ئەوە ئیسلامبوونی زانست لەبەر ڕاوەستان و دروستبوونی لەسەر "دوو خوێندنەوەکە" کار دەکات، بۆ ئەوەی سرووش و گەردوون بە یەك بەرنامە بخوێندرێنەوە، ئەمەیش بە سەرچاوەگرتنی لە چوارچێوەیەکی مەرجعی ڕاوەستاو لەسەر بنەمای یەکتاپەرستیی و تاکی پەیوەندیی نێوان بوون و دروستکەر، تاکێتی ڕاستیی و تێگەیشتنی لە سرووش و بوون، کۆکردنەوە لە نێوان لێکدانەوە و هۆی سرووش و مەبەست لە سرووش و فەرمانەکانی، مەبەست لە گەردوون و یاساو هۆکارەکان تیایدا.

لێرەوە جیاوازیی ڕوون دەبێتەوە لە نێوان "بەرنامە– المنهج" بە مانای بنەماکانی بیرکردنەوە و ڕێکخەرەکانی توێژینەوە لە هەر بوارێکی بچووك، یان گشتیی لەگەڵ "بە بەرنامە بوون و بەرنامەکان– المنهجیە والمنهاج" لە دیدی "ئیسلامێتی زانستەوە"، بەڵام لە نێوان "زانیاریگەرێتی ـ المعرفیة" و "بەرنامەبوون ـ المنهجیة"دا لە چوارچێوەی بابەتی "ئیسلامێتی زانست"، پێکگەیشتن و لێکجودابوونەوە (الوصل والفصل) هەیە، وەك ڕەوانبێژان دەڵێن، یان گشتگیریی و تایبەتمەندێتی (العموم والخصوص) هەیە وەك زانایانی لۆژیك دەڵێن، کەوابوو "زانیاریگەرێتی" پێویستی بە "بەرنامەبوون" هەیە و ڕادەوەستێ لەسەری، هەروەك چۆن بە "بەرنامەبوون" شێوە کردارییەکەی لە چوارچێوەی "زانیاریگەرێتی"دا وەردەگرێ، کەوابوو لە نێوانیاندا

پەیوەندییەکی جیانەبووەوە هەیە.

"زانیاریگەرێتی" ڕادەوەستێ لەسەر چالاکییەکی هۆش و ژیری فراوان بۆ هەموو کردارەکانی ڕەخنەگرتن و شیکردنەوە و هەڵوەشاندن، ڕێکخەرە بۆ گشت پێکهاتە و بەخشەرەکان و پەیوەندیی و توانا بەدەستهاتووەکان لە ژێر سایەی "زانیاریی" هاوچەرخدا بۆ دۆزینەوەی گرفتە کۆمەڵایەتیی و ڕۆشنبیرییەکان و دووبارە لێکدانەوەیان بەپێی یاساکانی بە بەرنامەبوون و بنەماکانی و "بەرنامەی قورئان و زانیاری گەرێتی" بۆ ئەوەی ڕۆڵی خۆی جێبەجێ بکات لە "بە ئیسلامێتی زانیاریی" هاوچەرخدا و کرداری "کۆکردنەوە لە نێوان دوو خوێندنەوەکە" کە بۆ ئەوەی بێتەدی کە بە مەرجێکی دەزانێت بۆ دەربازبوون لە گرفتی بیر و زانیاریی لە سەر ئاستی جیهانیی و ناوخۆیی، ئەوە پێویستە پەیوەندیی نێوان "خودا"و پەنهان و نادیارەکان بە مرۆڤ و سروشتەوە دەربخرێت و زانیاریی و بەرنامەکانی ڕزگار بکرێن لە گوێنەدان، یان بڕوانەبوون، یاخود بێلایەنیی و بێدەنگبوون بە پەنهان و نادیارەکان، ڕزگاربوون لە دۆخی دابڕان لە نێوان ئاینگەریی و سروشت ـ اللاهوت والناسوت ـ، هەموو بیر و فەلسەفانەی کە دروستکراوەکانی مرۆڤەکانن کە تەنیا یەك خوێندنەوەیان هەیە.

ئەمەش کارێکە کە هەموو کەس ناتوانێت بەشداریی تێدا بکات هەستێ بە هەڵگرتنی هەندێك لە ئەرکەکانی، تەنیا ئەوانە نەبێت کە قورئان و بەشێك لە زانست و زانیارییان پێبەخشراوە کە بەسە بۆ ئاشکراکردنی ئەو چوونە ناویەکە بە بەرنامەیەی لە نێوان قورئانی مەزن و گەردوون و مرۆڤدا هەیە، چونکە هەر لۆژیکێك لە بەرنامە زانستییەکەیدا مەودای پەیوەندیی لەگەڵ پەنهانەکان دیاری نەکات وەك کارتێکەرێکی کارا لە گەردوون و جوڵەکانی دا، ئەوە ناتوانرێت قبولّ بکرێت، وەك لۆژیکێك کە توانای هەبێت بیر لە کەوتنە ناو هەڵە بپارێزێت و بەرنامەی کارکردن بەم مەودایەش ناتوانرێ دەست بخرێت بە بێگەردیی و تەندروستیی بێ پشتبەستن بە قورئانی پیرۆز.

کەواتە "ئیسلامێتی زانیارییەکان" بەرنامەیەکی مەعریفییە کە سنوورەکانی دیارییکراوە و بەشەکانی ڕوونە، لە لایەك بریتییە لە جێگرەوەی تیۆرە "ماددیی" و

دانراوەکان کە خودا و پەنهانەکانیان پشتگوێ خستووە، هەروەك چۆن لە لایەکی دیکەوە جێگرەوەیە بۆ سیستمی کڵێسایی کە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و سروشت لێکدادەماڵێ.

لە چوارچێوەی بەئاگابوونی ئێستامان بە "ئیسلامێتی زانیارییەکان" دەتوانین بڕیار بدەین کە بنەمای بەرهەمهێنانی زانیاریی لە چوارچێوە و تێڕوانینییەوە پێویستە دابمەزرێت لەسەر ئەم بنەمایانەی خوارەوە:

١ـ دووبارە بونیادنانەوەی دیدی ئیسلامێتی مەعریفی کە ڕاوەستاوە لەسەر پێکهاتە و تایبەتمەندیی تێڕوانینی ئیسلامیی تەندروست تا ئەو شتانە ڕوون ببێتەوە کە دەکرێت هەژمار بکرێن بە ڕێبازی زانیاری ئیسلامیی کە دەتوانێ وەڵامی پرسیارە گشتییەکانی مرۆڤ بداتەوە و نموونەی زانیاریی پێویست بەرهەم بێنێ، بێ تێپەڕاندنی هیچ شتێك لەمانە، بونیادی خودتوانایی بنێ بۆ ڕەخنەگرتنی زانستییانە، ڕەخنەیەك کە دەکرێ کەلەپوری زانایانی پێشوو لەخۆبگرێت و تێیشی پەڕێنێ، بتوانێت زانای هاوچەرخ بەرهەمبێنێت بە شێوەیەکی بەرنامە بۆ داڕێژراو و ڕێك، هاوکات توانا ببەخشێت بۆ بەرهەمهێنانی زانیاریی بە بەرنامە و بەرهەمهێنانی توانای ڕاڤە و لێکدانەوەی زانیاریی کە تەنیا وتاردان و ڕازییکردن نەبێت، بەڵکو لەسەر بنەمای بەرنامەڕێژی زانیاریی تەواو بێت.

٢ـ دووبارە پشکنین و ڕێکخستن و بونیادنانی بنەماکانی بە بەرنامەبوونی ئیسلامیی لە ژێر ڕۆشنایی "بە بەرنامەیی زانیاری قورئانیی ـ المنهجية المعرفية القرآنية" و ڕێنوێنییەکانی ئەو، چونکە بە ڕاستی زیانی زۆر تووشی ئەم بەرنامەیە بووە لە ئەنجامی خوێندنەوەی تاك و بەشبەشکردنی خوێندنەوە بۆ قورئان و خوێندنەوە بۆ بوون و مرۆڤ بە دوور لە قورئان، لە کۆن و نوێدا.

٣ـ بونیادی بەرنامەیەك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ قورئانی پیرۆز لە چوارچێوەی ئەم دیدە بەرنامەییەوە و بە هەژمارکردنی بە سەرچاوەیەکی سەرەکیی بۆ بەرنامە و ڕێباز و زانیاریی و بنەماکانی ژیاریی و ئاوەدانیی، ئەمەش داخوازی دووبارە بونیادنانەوە و

دارشتنەوەی ئەو زانستانەی قورئان کە بۆ ئەم بابەتە پێویستن و تێپەڕاندنی زۆرێك لە پاشماوەکان لەم بوارەدا دەکات، مرۆڤی عەرەب هەندێکجار تێگەشتنی بۆ قورئان لە چوارچێوەی تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەی مرۆڤە عەرەبەکانی پێشوو بووە کە سست و سنووردار بووە لە ڕووی کۆمەڵایەتیی و بیریەوە بە بەراوردکردن لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەی ژیاریی جیهانی سەردەم، لەو سەردەمەی زانیاریی و زانستەکانی تایبەت بە قورئان و فەرموودەکانی پەیامبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە فەڕمیی نووسرانەوە عەقڵی ڕەوانبێژیی و زمانەوانی بەرەو بەشبەشکردنی دەستەواژە و ڕستەکان دەچوون، لەو ڕوانگەی کە دەربڕینی بچووك باو بوو، هەر بۆیە ئەو بیرکردنەوەیەی لەوەوە بەدیهاتووە بۆ ئەو سەردەمەی خۆی تەواوە، بنەماکانی بەردەوام بە سوود و گرنگن کاتێك لە چوارچێوە مێژووییەکەی دادەنرێت، بەڵام لە سەردەمی ئێستادا کە عەقڵیەتێك زاڵ بووە داوای زانینی بەرنامەیی بۆ بابەتەکان و توێژینەوە بۆ پەیوەندیی ڕێکخەر لە نێوانیاندا دەکات بە شێوەی شیکردنەوە و ڕەخنەگرتنێك کە چوارچێوە زانستییەکان ڕێکبخات و بیبەستێتەوە بە بابەتە شارستانییە بڵاوەکان و پەیوەندییە جۆراوجۆرەکان، ئەمانە وا پێویست دەکات تێڕوانیی تازە بکرێتەوە بۆ زانست و ئامێرەکانی تێگەیشتن لە دەقەکان و خزمەت بکرێن و خوێندنەوەیان بۆ بکرێت بە خوێندنەوەیەکی کۆکەرەوە لەگەڵ گەردوون و تێکەڵبوونی بەرنامەیی لەگەڵی، پاڵفتەکردنیان لە جۆرەها ڕاڤە و شیکردنەوە و گرێدانە تۆکمە ڕێژەییەکان لە ڕێی لادانی "ئیسرائیلیاتەکان"[(١)] و گرێدانی توندی دەقەکان بە هۆی دابەزینیان و بۆنەکان و ڕووداوەکانەوە.

٤ـ بونیادنانی پرۆگرامێك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ سوننەتی پاکی پەیامبەردا ﷺ،

---

١ مەبەست لە "إسرائيليات" ئەو بابەتانەیە کە لە ئایینی ئیسلامدا بنەمای نییە و لە ڕێگەی شوێنکەوتەی ئایینە ئاسمانییەکان بە تایبەت لە جولەکەکانەوە دزەی کردۆتە نێو کلتوری مسوڵمانانەوە و تەنانەت هەندێکی وەکو فەرموودەی پەیامبەر، یان هاوەڵە بەڕێزەکانی سەیر کراوە، ئەمەش بە دروستکردنی زنجیرەیەکی نادروست بۆ گێڕانەوەیان.

هەروەها ئەویش لە چوارچێوەی ئەو دیدە بە بەرنامەییەوە (المنهجية)، بە هەژمارکردن و دانانی بە سەرچاوەیەکی ڕوونکردنەوەی بەرنامەو شەریعەت و زانیاریی و بنەماکانی شارستانیەت و ئاوەدانیی.

بێگومان قۆناغی پێغەمبەرایەتی و سەردەمی هاوەڵەکانی، قۆناغێك بوو پشتی ڕاستەوخۆی دەبەست بە پێغەمبەر ﷺ و شوێنکەوتن و چاولێکردنی گوفتار و کرداری لەوەی دەیفەرموو و ئەنجامی دەدا، ئەوەتا دەفەرموێ: (خُذوا عنِّي مَناسِكَكُم)[1]، هەروەك دەیفەرموو: (صَلُّوا كما رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي)[2] و شوێنکەوتن و چاولێکردنیشی پشت دەبەستێ بە جموجوڵەکانی ژیانی پەیامبەر ﷺ، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە ڕەوشتەکانیدا قورئانی بەرجەستە دەکرد، بۆیە لە ڕاستیدا هیچ گرفتێك لە نێوان دابەزینی قورئان و جێبەجێکردنی لە واقعدا نەبوو، جێبەجێکردن و ڕوونکردنەوەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەو کەلێنانەی پڕ دەکردەوە کە دەکەوتنە نێوان پەیامە خودابیەکە و ژینگە عەرەبی و ئیسلامییەکەوە بەهۆی تێگەشتنی گەلەکەی و توانا هزری و زانستییەکانیان و بوونی ئەو دۆخە کۆمەڵایەتیی و هزریی و ئاستە مەعریفییەی کە لە ناویاندا بڵاو بوو، بۆیە ئەو هاوەڵانەی فەرموودەکانیان گێڕاوەتەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) سوور بوون لەسەر ئەوەی هیچ بەشێك لەوەی کە پەیوەندیی بە ژیانی پەیامبەرەوە هەبێ لە دەستیان نەچێت، چونکە ئەوە تەنیا ڕێگە بوو بۆ تێگەیشتن لە پرۆگرامە ڕێکەکان دەربارەی ڕووداوە جیاجیاکان، هەر لەبەر ئەمەیشە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ فراوان و گشتگیرە و ئەندازەیەکی زۆر لە گوفتار و کردار و ڕێگەپێدان

---

١ فەرموودەیەکی صەحیحە ئیمامی موسلم لە جابرەوە گێڕاویەتیەوە. وەك لە کتێبی (التلخيص الحبير)دا هاتووە لە فەرموودەی ژمارە (١٠١٢).

لەراستییدا ئەم دەقەی سەرەوە ئیمامی بەیهەقی گێڕاویەتیەوە لە کتێبی (السنن الكبرى)دا ژمارە (٩٣٠٧)، بەڵام ئیمامی موسلم بە دەقێکی هاوشێوەی ئەم دەقە گێڕاویەتیەوە. وەرگێر.

٢ فەرموودەیەکی صەحیحە، ئیمامی موسلیم و بوخاری گێڕاویانەتەوە. وەك لە کتێبی (التلخيص الحبير)دا هاتووە لە فەرموودەی ژمارە (٢٨٤)دا.

له خۆ دەگرێ، هەموویشمان بە درێژی پێگەیشتووە تا هەموو کات بتوانین شوێن ئاکاری ڕۆژانەی بکەوین لە ڕۆشتن و هاتنی، لە ئاشتی و لە جەنگی، لە فێرکردن و دادوەریی و سەرکردایەتی و فەتواکانی و تەنانەت لەو کردارانەشی کە وەك مرۆڤ ئەنجامی دەدا، بە جۆرێك شێواز و ڕێبازیمان بۆ دیار دەبێت لە مامەڵەکردنی لەگەڵ بارودۆخ و ڕووداوەکاندا، هەروەها تایبەتمەندیی و ئەو دۆخەشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵە و هەڵسوکەوتی تێدا کردووە، کە بە دڵنیاییەوە جیاواز بووە لەگەڵ بارودۆخی ئێمە لە ڕووی پێکهێنەر و هزر و بیرەکانەوە.

هەموو کات و بە بەردەوامیی جەخت لەسەر ئەوەیە کە تەنها سەرچاوەی بەدیهێنەری فەرمانەکان قورئانی پیرۆزەو تەنها سەرچاوەیەکیش کە ڕوونکەرەوەی قورئان بێت بە شێوەیەك ڕوونکردنەوەکانی ناچارکەر (ملزم) بێت لەسەرمان، سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ.

## نموونەیەك بۆ مامەڵەکردنێکی زانستییانە لەگەڵ سوننەتدا

لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) لە سوننەتەکانیدا پەیوەندیی نێوان پەیام و پەیڕەوە قورئانییەکە و بارودۆخی سەردەمی خۆی بەرجەستە دەکرد، زۆر قورسە تێگەیشتنی زۆرێك لە بابەتەکان بەبێ تێگەیشتن لەو دۆخەی پەیامبەری تێدا بووە، بۆ نموونە کاتێك ڕێگریی دەکات لە وێنەکێشان و پەیکەر تاشین و وێنەکێشەکان بە کەسانێك هەژمار دەکات "کە توندترین سزایان هەیە لە ڕۆژی دوایی دا" نابێ لەو قەدەغەکردنە وا تێبگەین کە قەدەغەکردنی پێغەمبەرە بۆ شتومەکە جوان و لاشەدارەکان، چونکە ئەوە دژایەتیی هەیە لەگەڵ تێگەیشتنی حەزرەتی سولەیمان (دروودی خوای لەسەر بێت) کە جنۆکەکان هەر وێنە و پەیکەرێکیان بۆ دروست دەکرد کە بیویستبا، هەروەك چۆن نابێ لە چوارچێوەی پرسیارەکانی سەردەمی خۆشمان لێی تێبگەین و بڵێین: خۆ ئێمە ئامادە نین و حەزیشمان لە پەرستشی ئەم پەیکەرانە

نییە، کەواتە بۆ لەسەر ئێمە حەرامە؟ چارەسەرەکەشی بە فەتوایەك نابێت کە لەسەر بەشێك، یان جۆرێکی بدرێت و بوترێت ئەمەیان حەڵاڵە و ئەمەیان حەرامە، بەڵکو پێویستە ڕەچاوی هەڵوێستی بە بەرنامە و پڕۆگرامی پێغەمبەر ﷺ بکرێت کە لە چەند هەڵوێستی جیادا ئاماژەی پێداوە وەك دەفەرموێت: (لَوْلَا أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُ عَهْدٍ بِكُفْر)[1] بەم جۆرە ڕێگەی مشتومڕ نامێنێ و ڕێگەش نادرێ مشتومڕ سەر بکێشێت بۆ ئەوەی ئایا سوننەت بەڵگەیە یان نا؟، چونکە سوننەت لە چوارچێوەی ئەم پڕۆگرامە زانستییەدا دەبێتە بنەمایەکی پڕۆگرامیی ئاسان بۆ شوێنکەوتن، نەك ئەوەی چەند باسێکی پەرش و بڵاو بێت کە هیچ جۆرە پەیوەندییەکی پڕۆگرامیی کۆیان نەکاتەوە.

لە ڕوانگەی ئەم نموونەی باسمان کرد ئەتوانین بڵێین: کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاری بۆ ئەوە دەکرد پەیوەندیی نێوان دروستکردنی پەیکەرە بوتیەکان و هەوڵدان بۆ بە نرخکردنیان لە گەلێك داببرێت کە ماوەیەکی کورت بوو وازیان لە پەرستنیان هێنابوو، کە نەدەکرا بە هیچ شێوازێك ئاسانکارییان بۆ بکات لە شتێکدا کە ئەگەر بە گومانیش بێت ڕەنگە کار بکاتە سەر یەکخواپەرستییان، بۆیە ئەو یەکلاییکردنەوە و توندییە پێویست بوو لەلایەن پێغەمبەرەوە، بێگومان گەیشتن بە پڕۆگرام و بەرنامەی

---

[1] ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا (ج ٢ ص ٥٧٤) بە ژمارە (١٥٠٩) گێڕاویێتیەوە. تەواوی فەرموودەکە: (يا عَائِشَةُ لَوْلَا أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ لَأَمَرْتُ بِالْبَيْتِ فَهُدِمَ فَأَدْخَلْتُ فيه ما أُخْرِجَ منه وَأَلْزَقْتُهُ بِالْأَرْضِ وَجَعَلْتُ له بَابَيْنِ بَابًا شَرْقِيًّا وَبَابًا غَرْبِيًّا)، ئیمامی ترمیزی و نەسائیش لە عائیشەوە گێڕاویانەتەوە، ئیمامی موسلیم هاوشێوەی ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە لە عائیشەوە کە دەفەرموێ: (لَولا أنَّ قَومَكِ حَديثوا عَهدٍ بِجاهِلِيّةٍ لأَنْفَقتُ كَنزَ الكَعبَةِ في سَبيلِ الله، وجَعَلْتُ بابَها بالأَرض ولَأَدْخَلْتُ فيها مِنَ الحجر). لەم فەرموودانەدا ئاماژە بەوە کراوە کە پێغەمبەر ﷺ ویستویەتی (کەعبە) بڕووخێنێت و بە شێوازێکی نوێ دروستی بکاتەوە، بەڵام بیری لەوە کردۆتەوە کە گەلەکەی تازە مسوڵمان بوون و ڕەنگە تێکدانی کەعبەیان لا قورس بێت و کێشەو مشتومڕ دروست بکەن، بۆیە لەبەر ڕوونەدانی ئەو کێشەیەو لەبەر ڕەچاوکردنی بارودۆخەکە، پێغەمبەر ﷺ ئەو کارەی نەکرد کە حەزی دەکرد بیکات، لە چەند فەرموودەیەکی دیکەشدا ئاماژە بەوە کراوە کە پێغەمبەر ﷺ ویستوویەتی کارێك بکات، بەڵام لەبەر ڕەچاوکردنی بارودۆخی سەردەمی نەیکردووە. وەرگێڕ.

ڕێکخەر بۆ هاوشێوەی ئەم بابەتانە و خوێندنەوەیەکی زانستییانە بۆیان، فەرمووده و سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەخاتە بازنەیەکی پڕۆگرامی و تێگەیشتنێکی پڕۆگرامییانە لە بری ئەوەی لە چوارچێوەیەکی وردەکاریی دژ بە یەکدابن کە زۆرجار کەسانی جیاواز دەیانکەنە قسە و فەتوای بەش بەش و پچڕ پچڕ و جیاواز کە شتی دژ بەیەکی لێ نیشان دەدەن، وەك ئەوەی قسەی زانایانی خاوەن بۆچوونە جیاوازەکان بێت.

عەرەبەکان لە سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئاندا پەیوەست بوون بە تێگەیشتنێکی شوێنکەوتنانە لە چوارچێوەی ئەو وردەکاریی و روونکردنەوانەی لە وتار و کردار و ڕەزامەندییەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ وەردەگیران، پێغەمبەریان ﷺ کردبوو بە پێشەنگی کرداریی ڕاستەقینەی خۆیان کە هەموو بەرنامە گشتییەکەی لە ژیانی خۆیدا بەرجەستە کردبوو بە جۆرێك کە لەگەڵ بارودۆخ و هەلومەرجی ژیانیان دەگونجا، لەڕێی ئەم تێگەیشتنەوە بۆ بەرنامەی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بیرۆکەکانی (المأثور والمنقول)[1] لە کەلەپوری تێگەیشتنمان بۆ دەقەکان گەشەی کرد، دواتر وەك هەوڵێك بۆ کەمکردنەوەی پابەندبوون بەم شوێنکەوتنەوەوە کەسانێك پەنایان برد بۆ لێکدانەوەی "پەنهانی – الباطني" و لێکدانەوە لە ڕێی ئاماژە و ئیشارەتەوە، وەك دەربازبوونێك لە شوێنکەوتنی مانای دەقاودەقی بەڵگە گێڕراوەکان، بەڵام ئەم هەوڵانەیان زیاتر کارەکەی شێواند، ئەوەی پێویست بوو بکرێت بریتی بوو لە گەیشتن بە بەرنامە و پڕۆگرامە قورئانییەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ڕێنموییەکانی ئەوەوە هەموو وردەکارییەکان ڕێکخرابانایە و هەر لەو چوارچێوەیەشدا

---

[1] ئەم دەستەواژەیە بە واتای: ئەو شتانەی لە هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان و پێشین (سلف) و پێغەمبەری خواوە گێڕراونەتەوە بە مانا فراوانەکەی وتەکانی پێغەمبەری خواش دەگرێتەوە، دانەر مەبەستی ئەوەیە: "کە دەبێ تێگەیشتن لە دەقە قورئانییەکان بە چۆنیەتی تێگەیشتنی پێغەمبەر و هاوەڵانی وابەستە بکرێت"، واتە ناکرێ ڕاڤە و شیکاری بۆ دەقەکان بکرێت بێ گەڕانەوە بۆ ئەو تێگەیشتنەی ئەوان کە بۆمان گێڕراوەتەوە و گەیشتووە پێمان. وەرگێڕ.

تێگەیشتنی بۆ کرابایە تا مەبەست لێیان ئاشکرا بوونایە و ئامانجەکانیشی ڕوون ببانەیەوە و تێگەیشتنێکی گشتگیریی ئامانجە شەرعییەکان بڵاوبووبایەوە.

بێگومان عەقڵیەتی سەردەم بەردەوام بە دوای ڕێکخەری شتەکاندا وێڵە و لە هەوڵی گەیشتن دایە بە بەرنامەیەکی هەمەلایەنی تەواو، جا لە ژێر ڕۆشنایی ئەم بەرنامەیەدا شیکردنەوە و ڕەخنە و ڕاڤەکردن چوارچێوەیەکی بابەتییانە وەردەگرێت بۆ بزووتنەوەی هزریی لە مامەڵەکردنی لەگەڵ بابەتە گەردوونی و ناوچەییەکاندا و بەهۆی ئەم پرۆگرامەوە دەتوانین لە مەبەستەکانی قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) تێبگەین، بێئەوەی بچینە ناو ڕابردوویەکی بێدەنگەوە کە ڕێڕەوی گۆڕانکارییە مێژووییەکان بسڕێتەوە، یان بچینە ناو لێکدانەوە پەنهانییەکان (الباطنية)، یان هەوڵە پڕ کەموکورتییەکانی تازەگەریی کە هەوڵی دروستکردنی گۆڕانکاریی، یان لێکدانەوەی بەشێك دەدات بۆ ڕابردوو تا بەرهەمەکەی وەك خۆی بگێڕێتەوە بۆ ئێستا، وەك ئەوەی باسکردنی ڕابردوو بێت لە بەرگێکی نوێ و بە بەکارهێنانی زاراوە و ناونیشانی نوێ.

٥- چاوخشاندنەوە و دووبارە خوێندنەوە و تێگەیشتنی کەلەپوری ئیسلامییمان بە خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی شیکاریی زانستییانە بۆی، کە دەرمان بێنێت لەو سێ بازنەیەی ئەمڕۆ زاڵە بەسەر مامەڵەکردنمان لەگەڵ کەلەپووری ئیسلامییدا، ئەوانیش کە بریتین لە: بازنەی "ڕەتکردنەوە بە ڕەهایی" و بازنەی "وەرگرتنی ڕەها" و بازنەی "دروستکردنی گونجاندنیکی هەڵبژاردەیی هەڕەمەکیی (التلفيق الإنتقائي العشوائي)"، چونکە تا لەم سێ بازنەیەدا خۆمان گەمارۆ دابێت ناتوانین بگەینە ئەو شتانەی کە پێویستە لە کەلەپووری ئیسلامییدا پێی بگەین، هەروەك چۆن ناشتوانین بگەینە بڕیاری کۆتایی و یەکلاکەرەوە لەو بابە کەلتوورییانەی کە پێویستیان بە بڕیاری لەو جۆرە هەیە تیایاندا.

٦- بونیادنانی پرۆگرامێك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کەلەپووری مرۆڤایەتیی سەردەمدا کە شێوازی بیر و مامەڵەکردنی مرۆڤی مسوڵمان بگۆڕێت لەو شێوازەی کە ئێستا

هەیەتی، کە دواکەوتووە لە بازنەی هەوڵەکانی لێکنزیککردنەوە لەگەڵ بیری بەرامبەر و تەرخانکردنی، چونکە پێیوایە کە ئەم کەلەپوورە ناوەندێکی جیا و تایبەتمەندە، پاشان دەست دەکات بەبەراوردکردنی لەگەڵ کەلەپووری خۆی، کە کۆتایی دێت بە ڕەتکردنەوەی ڕەهای، یان وەرگرتن و قبوڵکردنی ڕەهای بە ڕۆحیەتێکی لەخزمەتدابوون و وەڵامدانەوە بەتەواوی، یان هەڵبژاردن لێی بە هەڕەمەکیی و نەزانانە بۆ پرۆگرامەکە.

ئەم هەنگاو، یان لایەن، یان شەش تەوەرانە، ئەو خاڵانە بوون کە ناومانان بنەماکانی "ئیسلامێتی زانستەکان، یان بەرنامەی یەکخواپەرستی بۆ زانیاری، یان ئیسلامێتی زانستە کۆمەڵایەتیی و مرۆییەکان، یان ئاراستەکردنی زانستە سروشتییەکان بە ئاراستەیەکی ئیسلامیی، یان ڕەگەزدۆزی ئیسلامییانە بۆ زانستەکان".

ئێمەی مسوڵمان یەکەم جارە خۆمان لە بەردەم دۆخێکی جیهانیدا ببینین کە هەوڵی بە دامەزراوەییکردنی زانست و زانیاریی و دۆزینەوەکانی زانست و بەرهەمەکانی دەدات، ڕێکخستنێك کە پەیوەندیی نێوان خودا و گەردوون و مرۆڤ دەپچڕێنێت، پەنهان و نادیارەکان پشتگوێ دەخات و خۆی لێ گێل دەکات، زانست و ڕەوشت لێك دووردەخاتەوە، ئەمەش بە پێشنیازکردنی چەند بیروبۆچوونێك دەربارەی "بوون"، کە هەندێکیان لەگەڵ بیروبۆچوونی ئیسلامیی ئێمە دژ بە یەکن و ناگونجێن، ڕەنگیشە هەندێکی وابێت و هەندێکیشی وانەبێت، چونکە بابەتەکە وانییە کە ئێمە لە وتە ئایینییەکانی خۆمان هەڵبژاردەیەك بکەین هەرچی لەگەڵ بۆچوونەکانی ئەوان گونجان بڵێین پێشتریش لای خۆمان هەبووە، ئەگەریش نەگونجا ڕەتی کەینەوە و مۆری کافرێتی لێ بدەین، لۆژیکی ئێمە هەر لە سەرەتاوە سەبارەت بە زانستە گەردوونییەکان لۆژیکی ئاینگەری قەشەیەتی نەبووە، داواشمان لێنەکراوە شوێن کەسانی دیکە بکەوین، چونکە ئەزموونی ئەوان لە بەرەنگاربوونەوەی زانست و دەستکەوتەکانی، لە ئەزموونی ئێمە جیاوازە، ئەگەر قورئان پەیامێك بوایە وەك

ئایینگەرایی قەشەکان، ئەوە تەنیا ڕێگەی بە یەك خوێندنەوە دەدا، خوێندنەوەی یەکەم و بەس،[1] لە کاتێکدا ئێمە فەرمانمان پێکراوە بە پێچەوانەی ئەوە، ئێمە شەڕ لەگەڵ زانستدا ناکەین، چونکە دەزانین کە سرووش (وحي) لە گەردوونە کتێبییەکەی خودادا هەمان سرووش (وحي)یە لە گەردوونە سروشتییەکەدا، هەرکات لادانێك درایە پاڵ زانست، ئەوە پێویستە ئەو زانستە لەو لادانە پاك بکەینەوە، ئەگەر ڕاڤەکردن و لێکدانەوەیەکی نادروست خرایە پاڵ دەقێك، ئەوە پێویستە ئەو ڕاڤەکردن و لێکدانەوە نادروستە ڕەت بکەینەوە و ئەو لادانانە هەڵبوەشێنینەوە کە لادانی زیادەڕۆییکەران و لێکدانەوەی نەزانان و دەستهەڵبەستی کەسانی لاڕێکانن.

ئەمە بنەمای کۆکردنەوەیە لە نێوان زانست و زانیارییەکان و پەیوەستکردنیان بە بەرنامە و پرۆگرامی زانیارییە قورئانییەکەوە، چونکە لە سەردەمانی پێشوودا ئایین تەنیا بەرەنگاری بیروبۆچوونە عەقڵییە دەستکردە ڕووتەکان دەبوویەوە کە ئەو بۆچوونانە پرچەك و ئامادە نەبوون بە زانستە جێبەجێکاریە هاوچەرخەکان و دەرەنجامەکانیان کە بووە هۆی دروستبوونی چەندین بۆچوون کە شێوازە تەقلیدییەکەیان تێپەڕاندبوو.

کەواتە ئەوەی لە ئێمە داواکراوە و فەرمانمان پێدراوە، گێڕانەوە و سەندنەوەی زانستە لەو بۆچوون و مەزهەبە خراپانە و پاشان پاکژکردنەوە و بە دامەزراوەییکردنی بە لۆژیکی کۆکردنەوەی هەردوو خوێندنەوەکە: خوێندنەوەی سرووش و خوێندنەوەی گەردوون.

---

[1] واتە تەنیا خوێندنەوە ئایینیەکە دوور لە گەردوون. وەرگێڕ.

## شێخولئیسلام و ئیسلامیبوونی زانست

ئێستا دێینە سەر پەیوەندیی ئیبنوتەیمیە بە (ئیسلامیبوونی زانستەوە)، دوای ئەوەی ڕوونمان کردەوە و بنەما و پایەکانیمان خستەڕوو، ڕەنگە کەسێك بڵێ ئیبنوتەیمیە، چ پەیوەندیی هەیە بە (بەئیسلامیبوونی زانست)ەوە، لە کاتێکدا ئەم پرۆسەیە، پرۆسەیەکی نوێکەرەوەی فیکریی و مەنهەجیی زانستییە، بنەماکانی ڕوون نەبوویەوە تا قۆناغی عەقڵی سێهەم (الطور العقلي الثالث) لە قۆناغەکانی عەقڵی مرۆڤایەتی کە پشت دەبەستێت بە بەرنامەبوونی زانستی (المنهجية المعرفية)، وەك بنەما و سەرگەیەك بۆ بنیاتنانی فیکریی و مەنهەجیی و زانستیی، لەهەمانکاتدا ئەم پرۆسە نوێیە هەوڵێکی ئیسلامییانەی سەردەمە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو مەیدانخوازیە (تحدی)ی لە ڕووی فیکریی و مەعریفیی و ڕۆشنبیرییەوە سەپێنراوە بەسەر هەموو جیهاندا لەلایەن ناوەندێتی وڵاتانی ڕۆژئاوای هاوچەرخەوە؟ لە کاتێکدا ئیبنوتەیمیە کەسێکی سەلەفییە و لە زانایانی سەدەی هەشتەمە و قوتابی و بڵاوکەرەوانی زانستەکەشی هەر سەلەفیی بوون؟ ئایا ئەمە هەوڵێکە بۆ ئەوەی شەرعیەتێکی کۆن بکەنە ڕووکاری هەوڵێکی نوێ؟ یاخود بۆ ئەوەیە کە ڕووکەشێکی سەلەفییانە بکرێت بەسەر ئەم مەسەلەیەدا و بکرێت بە دۆزێك کە جێگای گرنگیی هەموولایەك بێت؟ یان هەوڵیکە بۆ وابەستەکردنی شتێکی نامۆی نوێ بە شتێکی کۆنی ناسراوەوە بۆ ئاشناکردنی بە مەبەستی لابردنی نامۆیی لەسەر هەڵگرانی، یان جگە لەمانە چییە؟

ئێمەش دەڵێین: هیچێك لەمانە نییە، چونکە پەیوەندیی ئەم پرۆسەیە بە فیکر و بنەما فیکرییەکانی ئیبنو تەیمیەوە پەیوەندیەکی بەهێزی بەرجەستەیە و دەتوانین بەم شێوەی خوارەوە ڕوونی بکەینەوە:

هزر و فیکر هەروەك زیندەوەرەکان وایە لە قۆناغی تۆوێکی باشدا، چەند ساڵێکی پێدەچێت پێش ئەوەی بڕوێت، ڕەنگە دوای ئەوەی دەڕوێت، لە قۆناغی کۆرپەلەییدا چەند ساڵکی دیکەی پێویست بێت هەتا گەشە دەکات و پێدەگات، جا کە پێگەیشت و

به تەواوی کامڵ بوو، ڕەنگە کارێکی ئاسان نەبێت بۆ خەڵکانێك کە بیریان سنووردارە، یان تەنها یەك لایەن دەبینن، پەیوەندیی نێوان ئەو تۆوە سادەیە لەگەڵ ئەو گیاندارە زیندووەدا ببینن!

هەرکات ئەم فیکرەیە ڕوون بوو، ئەوا نووسەر دەتوانێت دەست پێبکات بە بەراوردی حاڵەتی ئوممەتی موسڵمانان لە کاتی ئیبنوتەیمیەدا بە حاڵەتی ئوممەتی موسڵمانان لە ئێستایدا، هەروەها بەراوردکردنی حاڵەتی جیهانی ئەو کاتە لەگەڵ جیهانی ئەمڕۆدا، بۆ ئەوەی زۆر خاڵی لێکچووی بۆ دەربکەوێت، بە ئەندازەیەك کە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی تەواو ببێت هەتا خاڵە جیاوازەکان بدۆزێتەوە لە نێوانیاندا ئەگەر چاوپۆشی لە ناوەکان و هەندێك وردەکاریی دیکە بکات، بێگومان لێکۆڵەر خاڵی لێکچووی زۆری بۆ دەردەکەوێت لە نێوان کاتی ئێمە و کاتی شێخولئیسلامدا، لە ڕووی فیکر و ڕۆشنبیریی و سیاسەت و ئابووریی و پەروەردە و بەڕێوەبردن و شتانی تریش، هەروەها ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە چۆن دووبەرەکیی هەبووە و ئێستاش هەیە لە نێوان مەمالیك و غەیری مەمالیك کە دەسەڵات و ماڵ و موڵکی ئوممەتی موسڵمانیان لە دەستە و چۆن ئوممەتی ئیسلام هاوشێوەی ئێستا بووبوویە خوانێك کە خاچپەرستان و تەتار سەریان تێکردبوو، بە هەمانشێوە ئەوە دەبینێت کە پەرتەوازەیی و جودایی و دووبەرەکیی مەزهەبیی بەربڵاو بووە و جەستەی ئوممەتی بە هیلاك بردووە.

بێگومان لێکۆڵەر هەندێك جیاوازییش دەبینێت لە نێوان مەمالیکی ئەو کاتە و هی ئێستا، مەمالیکی ئەو کاتە زۆر ئازاتر و خانەدانتر بوون لەوانەی ئێستا، هەروەك چۆن تەتارەکانی ئەمڕۆ دڕندەترن لەوانەی ڕابردوو، خاچپەرستانی ئەمڕۆ دەسەڵات و داهاتی جیهانیان لە دەستدایە، دەتوانن بەکاری بێنن لە دژی هەرکەسێك بیانەوێت، بە هەر شێوازێك و لە هەر کاتێکدا ویستیان بێت.

کەوابوو، شێخولئیسلام و قوتابخانەکەی چۆن ڕووبەڕووی ئەو حاڵەتە بوونەوە؟ ئەی ئەو چ ڕۆڵێکی بینی؟

١ـ ئیبنوتەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، سەرەتا هەستا بە کارێك کە دەکرێت پێی بڵێین: "هەڵسەنگاندنی دۆخەکە"، ئەمەش لە ڕێی لێکۆڵینەوەی حاڵەتی ئوممەت و ئەوەی تێیدا ڕوودەدات و ئەوەی لە دەرەوەی ئوممەت ڕوو دەدات و ئەوانەش چاویان تێبڕیوە، هەستا بە دیارییکردنی دەروازەکانی قەیرانەکە لە لایەك و دەروازەی چارەسەر و گۆڕان لە لایەکی دیکە، هەستا بە داڕشتنی "گوتاری چاکسازیی و گۆڕان" و "بە پەیڕەویکردنی نوێبوونەوە ـ منهجية التجديد".

٢ـ ئیبنوتەیمیە درکی بەوە کردبوو کە فاکتەری ڕووخێنەر کە تووشی ئەم ئوممەتە هات ئەوە بوو کاتێك (پەیڕەوییبوونی دروست)یان لە مامەڵەکردن لەگەڵ قورئان و سوننەتدا پشتگوێ خست، ئەمەش سەری کێشا بۆ تێڕوانینی جوزئیی و دژ بەیەك، ئەمەش بووە هۆی دوورکەوتنەوە لە نیگای پەروەردگار و سەرقاڵبوونی هەندێك بە زانستە کۆنەکانەوە، هەندێکی دیکە بە عەقڵ و لۆجیك و کردنی بە پێوەر و بەهەندوەرگرتنی زیاد لە توانای خۆی، خەڵکانێکی دیکەش ڕوویان کردە بابەتەکانی تەسەوف و عیلمی ئیلاهیات و هەندێکی دیکە خۆیان دایە پاڵ کۆمەڵانی وەك (الباطنية) وکۆمەڵ و تاقمە گومڕاکان، دوای ئەوەی خاسیەتەکانی فیکری ئیسلامییان ونکرد، بە هۆی هەواو ئارەزووی خۆیانەوە گومڕا بوون و سیستمی مەعریفە و بنەماکانی مەنهەجی ئیسلامییان تێکچوو.

بنەما دروستەکانی مامەڵە لەگەڵ قورئان و سوننەت و زانیاریی هاوەڵانی پێغەمبەر و تابعین شێوێنرا، هەروەها تێڕوانینی زانستییانە بۆ زانست و پلەبەندییان توشی هەڵە بوو بە هۆی زۆر هۆکارەوە کە لێرەدا بواری ئەوەمان نییە بە تێر و تەسەلی باسی بکەین، نموونەی ئەو هۆکارانە: شێوازی مامەڵە لەگەڵ کەلتور و فەرهەنگی ئەو گەلانەی موسڵمان دەبوون، ناڕێکی پەیڕەوی وەرگێڕانی زانست و زانیاریی گەلانی دیکە، ئەمانەش بوونە هۆی دروستبوونی گیروگرفتی زانستیی لە گۆڕەپانی فیکری ئیسلامییدا.

بە هۆی ئەم خاڵەی کۆتاییەوە جیاوازیی و فرە ڕایی کەوتە نێو ئوممەتی ئیسلامەوە

و كۆمەڵی جیاجیا دروست بوو، هەر یەكەش لەو كۆمەڵانە خۆی پێ ڕاست بوو.

٣- دوای (هەڵسەنگاندنی دۆخەكە) و دیارییكردنی دەروازەی تووشبوونەكانی ئوممەت، ئیبنوتەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەستا بە دووبارە پۆلێنكردنی زانست و مەعریفە و پۆلێنكردنەكانی پێش خۆی پشتگوێ خست، پۆلێنی ئەوانەی كەلەپووری یۆنانیان وەرگێڕا و كەم و زیادیان كرد، ئەبی كیندی و فارابی و غەیری ئەوان كە بە (فەیلەسوفەكانی ئیسلام) ناودەبرێن، یان ئەوانەی كاریگەریی ئەو كەلەپوورە لەسەریان كەمتر بووە وەك ئیبن (الساعي الاكفانی)[١] و غەیری ئەو، هەموویانی پشتگوێ خست.

ئیبنو تەیمیە هات زانست و گوفتاری كرد بە سێ بەشەوە: عەقڵیی، میللیی، شەرعیی. عەقڵی ڕووت وەك ئەوەی فەیلەسوفەكان لێی دەكۆڵنەوە لە لۆجیك و سروشت و ئیلاهیات بەگشتی، هەربۆیە لە نێوان زانایاندا موسڵمان و موشریكیان تێدا بووە.

ئەوەی (میللیی)یە ئەو بەشەیە كە موتەكەللیمین گرنگی پێدەدەن لە سەلماندنی پەروەردگار و پێغەمبەرایەتی و ئایینی ئاسمانیی، موتەكەللیمین یەكڕان لە سەر تاكیی خودا و پێغەمبەرایەتی موحەممەد، بەڵام لە بابەتەكان و لێكۆڵینەوەكانیان تەنها پشت نابەستن بە قورئان و سوننەت، بۆیە شوێنكەوتووانی سوننەت و بیدعەتیشیان تێدایە، لەگەڵ فەیلەسوفەكاندا یەكدەگرنەوە لە بنەما گشتییەكانی زانست و بەڵگە و لێكۆڵینەوە و بوون و نەبوون، بەڵام تایبەتی تر لە فەیلەسوفەكان گرنگی بە ئیلاهیات دەدەن و بە سادەتر لێكۆڵینەوە دەكەن، ئەگەرچی فەیلەسوفەكانیش بەشێكی كەم گرنگیی پێدەدەن، هەروەك چۆن فەیلەسوفەكان بە تایبەتی تر گرنگیی بە سروشت دەدەن، هەرچەندە موتەكەللیمین لە هەندێ ڕوووەوە گرنگیی پێبدەن.

---

[١] ئیبن ساعی الاكفانی، لە زانایانی سەدەی شەشەمی هیجریە، كتێبێكی نووسیوە لە سەر پۆلێنكردنی زانست و ناوی ناوە (إرشاد القاصد)، هەر لەسەر ئەم كتێبە (طاش كبری) كتێبە بەناوبانگەكەی لە بواری پۆلێنكردنی زاستدا دانا و ناوی نا (مفتاح السعادة).

بەشی سێهەم لە زانست، شەرعییە، ئەو بەشەیە کە ئەهلی کیتاب و سوننەت گرنگی پێدەدەن، هەڵگرانی ئەم زانستەش، یان ئەوانەن زیاتر گرنگی بە ڕووکاری شەریعەت دەدەن وەك زانایانی فەرمووده بەگشتی و خەڵکی مسوڵمان ئەوانەی عیبادەتەکان بە ڕووکەشیی ئەنجام دەدەن، یاخود ئەوانەن کە واتاکان دەزانن، ئەمانەش لە زانستدا وەك ئەهلی عیرفانی تەسەوف وان بۆ شەرع، ئەمانە بەڕاستی ئوممەتی موحەممەدن بە تەواوی[1].

ئەوەی جێگای سەرنجە، ئیبنوتەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، ئەو پۆلێنکردنەی تەنها بۆ زانستەکان نەبووە، بەڵکو بۆ عیبادەت و چاکە و بیستنەکانیش، ئەمانەی هەموو بە هەمان پێوەر جیاکردۆتەوە، ئەمانەش هەموویان " عەقڵیی و میللیی و شەرعیی"ین لەلای.

لێرەوە ئیبنوتەیمیە حیکمەتێکی هێنایە کایەوە کە سەرەتایەك بوو بۆ گەشەیەکی فیکریی و کاریگەریی دانا لە سەر فیکری خۆی و قوتابی و شوێنکەوتووانی قوتابخانەکەی بە درێژایی مێژوو ـ تەنها هەندێکیان نەبێ ـ، ئەویش ئەوە بوو کە هەردوو بەشی عەقڵیی و میلليی خستە ژێر بەشی شەرعییەوە، وەك دەڵێت: (شەرعی بە ڕەچاوکردنێك هەرسێ بەشەکەیە و بە رەچاوکردنیکی دیکە تەنها تایبەتە بە بەشەکەی خۆیەوە) کەوابوو لە دوو لاوە شەرعیەتی دا بە بەشی شەرعیی، بەبێ ئەوەی شەرعیەت لە عەقڵیی و میلليی وەرگرێتەوە، وەك هەندێك وا دەکەن، لە کاتی وردبوونەوە لەم بۆچوونە جوانە کە پێموانییە کەسی دیکە پێش ئیبنو تەیمیە پەی پێبردبێت، دەبینین تۆوی (خوێندنەوەی مەعریفیانە)ی چاندووە کە هەر یەك لە عیبادەت و چاکە و زانست و گوفتار و بیستن لە بازنەیەکدا کۆ دەکاتەوە کە رەنگدانەوەی دیدی ئیسلامیی تەواو باڵی کێشاوە بەسەریدا، ئەو دیدەی کە دوو خوێندنەوەکە کۆ دەکاتەوە کە سیفاتی گشتگیریی دەداتە پەیڕەوی ئیسلامیی کە درك

---

[1] بگەڕێرەوە سەر (الفتاوی).

به هەموو لایەنەکانی پرسەکە بکات، بەبێ پشتگوێخستنی ناوەڕۆکەکەی[1]، لە هەمانکاتیشدا مەشروعیەت لەو فرەیی و جۆراوجۆریتی نێوان عەقڵ و شەریعەتەکان و (ملل) وەرناگرێتەوە.

دواتر شێخولئیسلام لە ڕێگەی پۆلێنکردنی زانستەوە هەڵدەستێت بە دیاریکردنی جێگەکانی: ڕەها (الاطلاق)، و گشتاندن (العموم) لە زانستەکاندا کە دەکرێت ببێتە بنچینەیەکی شارستانیانە، هەروەها جیاوازیی نێوان ڕێژەیی و تایبەتمەندێتی ڕوون دەکاتەوە و ئاماژە بە ڕێسایەکی مەعریفیی و فیکریی دەکات کە ڕێگە دەدات بە دروستبوونی ڕێژەیەکی دیارییکراو لە تایبەتمەندێتی و فرەیی بوون لە نێوان کۆمەڵێك لەگەڵ کۆمەڵێکی دیکەدا، چونکە جۆراوجۆرێتی بەشێکە لە سوننەتەکانی خوای گەورە لەم بوونەوەرەدا، بێگومان ئەوەش حیکمەتێکی تێدایە، هەورەها یەکبوون و یەکێتی یەکێکە لە سوننەتەکانی خوای گەورە.

لە نێوان ڕەها و ڕێژەیی، گشتاندن و تایبەتمەندێتی بۆ پۆلێنکردنی زانست، هەندێك ڕووبەری چوونە ناویەك (متداخل) هەیە کە نە عەقڵی پەتین و ناشچنە بواری (میللی)یەوە، کە دەکرێ لە ژێر سێبەری شەرعییدا جێگایان ببێتەوە بەبێ ئەوەی بابەتە شەرعییەکان کورتهەڵبێن لەسەری، وەك زانیارییە فیقهییەکان لەو ڕووەوە کە بنەماکانیان یەکپارچەن و بابەتە ورد و فەرعییەکانیشی زۆر و جۆراوجۆرن.

ئەم شێوازی پۆلێنکردنە ـ لە ڕاستیدا بە ڕای من ـ تۆوی بیرۆکەی ناونانی زاراوەی پرۆژەکەیە بە (أسلمة المعرفة) واتا ئیسلامییبوونی مەعریفە و زانست، ئەو پرۆژەیەی کە تەیارێکی گەشەسەندوی فیکری ئیسلامیی هەڵیانگرتووە، پەیمانگای فیکری ئیسلامیی ئەرکی جێبەجێکردنی گرتووەتە ئەستۆ.

هەستکردن بەوەی کە زانست و مەعریفە جۆراوجۆرە لە سەرچاوە و دەرەنجام و کاریگەریی و ئامانجدا، بنەمای پرسی ئیسلامێتیی زانست و مەعریفەیە، ئیسلامێتیی زانست و مەعریفەکان ڕازی نەبوو ملکەچی ئەو بیرۆکەیە بێت کە ڕۆژئاوا دەیەوێت

---

[1] بگەڕێوە سەر (معارج الوصول) ١/١٨٤ و (مجموع الرسائل الكبرى).

بەسەر هەموو جیهاندا بیسەپێنێت، ئەویش ئەوەیە کە زانست، بە زانستە مرۆییەکانیشەوە، تەنها ئەوەیە کە ئەوان بڵاوی دەکەنەوە، بۆ ئەوەی جیهان شوێنکەوتەی تایبەتمەندێتی ئایینی و بیروبڕوا و سەرچاوەکانی زانستی ئەوان بێت.

هەرکات لە ڕەهەندەکانی ئیسلامێتی زانست و مەعریفە گەشتین، ئەوکات دەزانین کە ئیشکالاتی زانستە مرۆییەکان دەکرێت لە تێڕوانینی ئیسلامییانەوە چارەسەر بکرێت، ئەوکات " ئیسلامێتی زانست" دەبێتە زەرورەتێکی ئایینی و شەرعیی، نەك تەنها بۆ ئوممەتی ئیسلام، بەڵکو بۆ ئایینەکانی دیکەیش، هەروەها دەبێتە زەرورەتێکی عەقڵیی بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، چونکە زانستە مرۆییەکانی سەردەم لە تێڕوانینێکی سەقەتەوە سەرچاوەی گرتووە و هەموو زانیارییەکانیان گشتاندووە لە هەموو بوارەکانی زانستە مرۆییەکانەوە، تەنها پشتبەست بوون بە ئەزموونی بەرجەستەی مرۆڤی ئەوروپی، بە بێ گەڕانەوە بۆ نیگا و هەڵوێستی سەبارەت بەو پرسانە، هەر بۆیە ئەو گشتاندنە شێوازێکی هەڵە و خۆسەپاندنی گرتۆتە خۆ، ئەمە جگە لەوەی کە ئەو پێشکەوتنانەی ڕوویداوە لەو جۆرە زانستانەدا لە بارودۆخێکی شارستانیی وادا ڕوویداوە کە نیگا و ئایین بە هەند وەرنەگیراون، ڕۆڵی عەقڵ زیاد لە پێویست گەورە کراوە و لە هەندێك ڕووەوە شێوێندراوە، ئەمانەش لە چوارچێوەیەکی مەعریفیدا کراوە کە باوەڕی بە دوو لایەنە و دژ بەیەك هەبووە، کە عەقڵ لە دژی نیگایە و دەبێت لایەکیان باڵا دەست بێت، بواری ئەوەی تێدا نەبووە کە سازاندن و تەواوکاریی هەبێت لە نێوانیان، ئەم جۆرە مەعریفەیە ناونرا مەنهەجی زانستی نوێ. ئەو جۆرە مەعریفەیە کەموکورت و بوار تەسك بوو، واتاکانی دابەشکاری کەمکردنەوە و گەورەکردن (تضخیم) و ڕۆچوون و کەمتەرخەمیی (الافراط و التفریط) تێدا بوو، کە دیارە ئەمانە هەموویان لەو شتانەن کە دەبێ ڕەنگدانەوەیان ببێ لەسەر ئەو بیردۆزانەی کە باس لە دیاردە ئاوەدانییە کۆمەڵایەتییە مرۆییەکان دەکەن.

یەکەم کاردانەوەی سلبیی و هەڵەی ئەو پەیڕەوە مەعریفیە ئەوەبوو کە: بوارەکانی زانستی ئەزمونگەریی تێکەڵ بە زانستە مرۆییەکان کرد و زانستە کۆمەڵایەتیی و

مرۆییەکانی قیاس کردە سەر زانستە ئەزمونگەرییەکان، ئەمەش بەکارهێنانی قیاسە لە شوێنی هەڵەدا، بەم شێوە زانستەکان تێکەڵ بوون، دواتریش بگرەوبەردەیەکی زۆر دروست بوو لە سەر جیاوازییکردن لە نێوانیاندا، هەمان شت ڕوویدا کاتێك گۆڕانکاریی کۆمەڵگە و کەلتووری گەلان بەراورد کرا ـ بە جیاوازیی بارودۆخ و شارستانیەتیان ـ لەگەڵ نموونە مێژووییەکەی ئەوروپای ڕۆژئاوا، لەسەر بنەما مەعریفیە هەڵەکە و هەوڵی گواستنەوەی ئەو ئەزموونە درا کە دەرەنجامی ئەزموونی ڕووبەڕێکی دیاریکراوە، بۆ ئەوەی ببێتە بنەمای زانستی سەردەمێك، هەوڵیاندا ئەو ئەزموونە بسەپێنن بەسەر کۆمەڵگەکانی ترداو زاڵبن بە سەر ڕێرەوی گەشەی ئەو گەلانەدا[1].

٤ـ عەقڵ و نەقڵ (الوحي): ئیبنو تەیمیە بنەما لە سەر پۆلێنکردنەکەی بۆ زانست، بۆچوونی پوچەڵکردنەوەی دوولایەنە دادەمەزرێنێت، پوچەڵکردنەوەی ئەو بۆچوونە بێ بەڵگەیەی کە بەربڵاو بووە، ئەوەی کە عەقڵ و نەقڵ یەکناگرنەوە.

بەو شێوە دەست دەکات بە ڕووخاندنی هەموو ئەو شوبهە و خەیاڵانەی کە ئەو بۆچوونەی لە سەر دروست بووبوون، ئەمەش بە ڕوونیی لە ناو کتێبەکانیدا (موافقة صحيح المنقول مع صريح المعقول، درء تعارض العقل و النقل، النبوات، معارج الوصول) بەدی دەکرێت.

دوای ئەمە هەستا بە سەلماندنی پەیوەندییەکی پتەو کە جیابوونەوە قبوڵ ناکات، دواتر عەقڵی خستە ژێر بەشی شەرعەوە بە شێوازێك کە بواری هیچ کەس نەدات ـ بە زۆری زۆرداریش بێت ـ بانگەشەی جیابوونەوەی عەقڵ و نەقڵ بدات، یان هەوڵی سەرخستنی لایەك بدات بە سەر ئەوی دیکەدا، بەم شێوازەش ئەم تێڕوانینەی کە پێیاندەوت "عەقڵبازی موعتەزیلە" و "پەیوەستبوون بە دەقەکان لەلای ئەهلی فەرموودە"ی تێپەڕاند و گەشتە قۆناغێك دەکرێت پێی بوترێت (عەقڵانیەتی شەرعیی).

هەروەها بۆچوونەکانی غەزالی و ئیبن ڕوشدیشی لەم بوارەدا تێپەڕاند، بۆچوونەکانی

---

[1] بۆ زانیاریی زیاتر لە سەر شوێنەواری خراپی سەپاندنی ئەزموونی ڕۆژئاوا لە سەر جیهان، بگەڕێوە سەر لێکۆڵینەوەی غرغوار مرشو (نظرية الاستتباع).

موتەکەلیمین بە گشتیی، ئەوەی ڕوونکردەوە کە عەقیدەی ئیسلامیی و تێڕوانینی ئیسلامیی پێویستی نەبووە بەو پەیڕەوە سەقەتەی موتەکەلیمین کە پەیڕەویان کردووە لە پرسەکانی عەقیدەدا بە پشتگوێخستنیان بۆ پەیڕەوی قورئان لە بەڵگەهێنانەوەدا کە پەیڕەوی دەکات لە هێنانەوەی بەڵگەی عەقڵیی و شەرعیی لە عەقیدەدا کە ڕێگە نادات بە لابردنی بچووکترین بەشی عەقیدە، یان زیادکردنی شتێك لەم بوارە گرنگەدا، یان پشتگوێخستنی هەر تایبەتمەندێتیەکی تێڕوانینی ئیسلامیی.

بەم شێوە پێویستی نامێنێت بۆ تەئویل و پەکخستن و شوبهاندن و تەجسیم، ئەو هەڵەیەی کە زۆرێك لە موتەکەلیمین تێیکەوتن، هەروەها هۆشداریی دەدات سەبارەت بە دروستبوونی شوبهە و گومان، ئەگەر مەنهەجی حەرفیەت پەیڕەو بکرێت لە وەرگرتنی فەرموودەکاندا بەبێ هەڵسەنگاندنی بە پێوەرەکانی ڕەخنە لە مەتن و سەنەد.

ئیبنو تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە زەمی ئەوانەی کە عەقڵ بە تەواوی پشتگوێ دەخەن و وشەکانی فەرموودە وەك خۆی وەردەگرن، دەڵێت: (هەندێك کات فەرموودەی صەحیح و بێهێز تێکەڵ دەکەن، بەڵگە بە شتێك دێننەوە ئەو مەبەستە نادات، بەڵگە بە قورئان دێننەوە لە ڕووی هەواڵدانەکانی نەك لە رووی و مەبەست و دەلالەتەکانی، ئەو بەڵگانەی کە بەڵگەی عەقڵیین لەسەر سەلماندنی پەروەردگار و تاکێتی خودا و پێغەمبەرایەتی و زیندوبوونەوە باس ناکەن، بەڵکو ڕەنگە ئەو بەڵگانە هەر نەناسنەوە و نەزانن کە بەڵگەی عەقڵیین، وا دادەنێن کە ئیمان بە پێغەمبەر جێگیر بووە و پێویستی بە بەڵگە هێنانەوە نییە)، دەبینین کە چۆن ڕەخنە لە هەندێك لە موتەکەلیمین دەگرێت لەبەر ئەوەی تەنها بەڵگە لۆجیکییەکان بەکار دێنن، بە هەمان شێوە ڕەخنە لە هەندێك لە فەرموودەناسان دەگرێت لەبەر ئەوەی بەڵگە عەقڵییەکانیان فەرامۆش کردووە، ئەمەش جەختکردنەوەیە لە سەر ئەوەی کە دەبێت عەقڵ و نەقڵ پێکەوە کۆ بکرێتەوە و پشتگیریی یەکدی بن.

لەو وتانەی تریدا ئەم واتایە جوانتر ڕوون دەبێتەوە، وەك دەڵێت: (بەڵگەهێنانەوە

بۆ ڕاستییەکان بە دروستبوونی مرۆڤ شتێکی زۆر باش و دروستە، بەڵکو ڕێگایەکی لۆجیکانەی تەواوە، لە هەمانکاتدا ڕێگایەکی شەرعییە و قورئان پاڵپشتی دەکات و ڕێنموونیی خەڵکیی بۆ دەکات، خودی مرۆڤ کە لە نەبوون دروست بووە، ئەوەی کە لە نوتفەیەکەوە دروست بووە و دواتر بووە بە گۆشپارەیەك، ئەمانە تەنها بەوە نەزانراوە کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردووە، بەڵکو خەڵکیی بە گشتیی و بە عەقڵی خۆیان ئەو زانیارییانەیان هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کردووە کە وەك بەڵگە بەکار بهێنرێت و خۆشی وەك بەڵگە بەکاری هێناوە، ئەمە بەڵگەیەکی شەرعیی دروستە، چونکە قورئانیش وەك بەڵگە باسی کردووە، لە هەمانکاتدا بەڵگەیەکی عەقڵییە، چونکە بە عەقڵ دەزانرێت کە بەڵگەیەکی دروستە، لە گەڵ ئەوەشدا زۆرێك لە لایەنە ناکۆکەکانی زانست ئەم ڕێگایە بەکار ناهێنن، هەرچەندە بەڵگەیەکی عەقڵیی و شەرعییشە.

جگە لەمەش نموونەی دیکە زۆرە لە قورئاندا، وەك بە بەڵگەهێنانەوەی هەور و باران لە چەند شوێنێکدا، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) (فصلت: ٥٣)، دواتر دەفەرموێت: (أَلَا إِنَّهُمْ فِي مِرْيَةٍ مِّن لِّقَاء رَبِّهِمْ أَلَا إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطٌ) (فصلت: ٥٤)، هەروەها ئەو نیشانانەی خوای گەورە باسی دەکات بۆ خەڵکیی بۆ ئەوەی بزانن کە قورئان ڕاستە، ئەمانە نیشانەی عەقڵیین وەك بەڵگە باس دەکرێن بۆ بە ڕاستدانانی قورئان، وەك دەبینین ئەمانە بەڵگەی شەرعیین و شەرع فەرمانی پێدەکات و نیشانی خەڵکیی دەدات، وە نموونەی دیکە زۆرە لە قورئاندا بۆ بەڵگەی عەقڵیی، دیارە ئەم ڕێگەیە ڕێگەیەکی شەرعییە، شەرع ڕێنموونیی خەڵکیی بۆ دەکات)[1].

شێخولئیسلام لێرەدا دەیەوێت واتایەکی فراونتر بداتە دەستەواژەی (شەرعیی)، بەڵام واتایەك کە لە لایەن شەرعەوە قبوڵە، دەیەوێت واتایەکی پێ ببەخشێت کە هەموو واتاکان کە شەرعین، دەیگرێتە خۆ، بە هەمان شێوە واتایەك دەبەخشێتە عەقڵ

---

[1] معارج الوصول، مرجع سابق.

که له ژێر شەرعییدا جێگای بێتەوە، ئەو عەقلْ وەك بەهرەیەکی خوایی لە قەڵەم دەدات کە دەتوانین لە ڕێگەیەوە شتە عەقڵییەکان دەرك پێبکەین، لە سەر ئەمانەشەوە ئیبنو تەیمیە لە بۆچوونەکەیدا دەگاتە ترۆپکی (عەقلانیەتی شەرعی) کاتێك وشەی (المیزان) بە عەقلْ ڕاڤە دەکات لەم ئایەتە پیرۆزەدا: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ) (الحديد: ٢٥)، لای ئیبنو تەیمیە تەرازوو (المیزان) عەقڵە، کە پاڵپشتی پێغەمبەران و کتێبەکان و بەڵگەکان دەکات بۆ ئەوەی خەڵك بە دادپەوەرانە هەڵسوکەوت بکەن و دادپەروەر بن لەو ئەرکەی پێیان سپێردراوە کە ئاوەدانکردنەوە و گەیاندنی ئەمانەت و جێنشینییە.

بەم مەنهەجە هاوسەنگە ئیبنو تەیمیە ئەو ئیشکالیەتەشی تێپەڕاند و بنەمای (خوێندنەوەی هەردوولا)ی نوێ کردەوە.

٥ـ سەبارەت بە شێوازی مامەڵەکردنی لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا، ئیبنو تەیمیە (ڕەزای خوای لێبێت)، پەیڕەوێکی زۆر نایابی هەیە کە بە ناو نووسینەکانیدا وەك گەوهەر بڵاوبۆتەوە، بە تایبەتی لە کتێبی (أصول التفسير)ەکەیدا باسی خاڵە سەرەکییەکانی ئەو پەیڕەوە دەکات.

ئەوەی گرنگە بە لای ئێمەوە لە بابەتی ئاشکراکردنی پەیوەندیی ئیبنو تەیمیە بە پرسی "ئیسلامیی زانستەوە" کە کۆڵەکەی ئەم پەیڕەوە بەندە لە سەر تێڕوانین بەرامبەر بە قورئان، ئەوەیە، کە قورئان لای شێخولئیسلام ئەو کتێبەیە (پەیڕەوێکی مەعریفی) تەواو لەخۆ دەگرێت ـ بۆ ئەوانەی کە توانای دۆزینەوەیان هەیە بە "کۆکردنەوە لە نێوان دوو خوێندنەوەکە"، ئەو پەیڕەوە مەعریفییە قورئانییە دەتوانێت کلیلی زانست و مەعریفەی دروست بدات بە مرۆڤایەتیی لە هەموو بوارەکانی زانست کە پێویستی پێیەتی لە بوارەکانی ئاوەدانکردنەوە و جێنشینی و گەیاندنی ئەمانەت، بابەتە ئەحکامەکانیشی تەنها نوێنەرایەتی یەك لایەنی ئیعجازی قورئان و خۆلەگرەونان (تحدی)ەکانی ناکەن، کە هەرگیز خەڵکانی سەردەمێك لەسەردەمەکان (بە سەردەمی دابەزینیشیەوە) ناتوانن هەموو بابەت و زانستەکانی فێر بن، هەر لە

سەر ئەم بنەمایە، ئیبنوتەیمیە توانی زۆر بە لێهاتووانە بەرامبەر فیکری نامۆ و تێکەڵبوو بە ئیسلام بووەستێ بە ڕاوەستانێکی جوان و نموونە بێنێتەوە بە لۆجیکی و فەلسەفەی یۆنانی لەلایەك، بە کەلەپوری تاقم و ئایینی گەلانی دیکە لەلایەکی دیکە، بۆیە هەڵدەستێت بە کرداری ڕووخاندن و بنیاتنان، کە ڕاوەستاوە لەسەر تێگەیشتن و زاڵبوون و تێپەڕاندن، هەموو ئەم کارانەشی لە ڕێگەی پەیڕەوی مامەڵەکردنی لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا بووە کە لێی سوودمەندن بووە بۆ دانانی کتێب و لێکۆڵینەوەکانی، نموونەی (نقض المنطق اليوناني) و (الرد على المنطقيين)، (الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح)، (منهاج السنة النبوية) و (اقتضاء الصراط المستقيم)، زۆری دیکە لە نووسینەکانی.

هەروەها توانیویێتی بەدیلە قورئانییەکان بۆ ئەو شتانەی خەڵکیی پێی سەرسام بوون لە زانستی گەلانی دیکە، پێشکەش بکات.

٦ـ لە ڕێگەی ئەو مەنهەجەی کە هەیبووە بۆ مامەڵە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا، توانیوێتی مەنهەجێکی گشتگیر دابنێ بۆ مامەڵە لەگەڵ هەموو کەلەپوور و زانستە ئیسلامییەکان بە هەموو جۆرەکانیەوە، تەنانەت لەگەڵ کەلەپوور و پاشماوە خراپ و نەشیاوەکانیش کە لە گەلانی دیکەوە بۆمان هاتوون.

ئەم پەیڕەوە دەکرێت ڕێسا و بنەمای زۆری لێوەربگیرێت بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کەلەپووری گەلانی دیکە، بە شێوازێك کە لەسەر سیستمە مەعریفییە ئیسلامییەکە بنەماکانی توند بکرێن، ئەو پەیڕەوە قورئانییەی کە لەسەر تێگەیشتن و زاڵبوون و تێپەڕاندن، ڕاوەستاوە.

ئەمە مشتێك بوو لە خەرمانی ئەو بیروبۆچوون و فیکرە گشتییانەی دەرهێنران لە نووسراو و کەلەپووری شێخولئیسلام ئیبنو تەیمیە، ئەوەمان بە ڕوونیی لا دروست دەکات کە هەستکردن بە قەیرانی فیکریی و مەعریفیی تەنها لە سەردەمی ئێستادا نەبووە و خەفەتی هەندێك بیرخواز و زانای ئەم سەردەمە نییە بە تەنها، بەڵکو ئەوە خەمێکە ڕەچەڵەك و درێژەپێدەری هەیە لە نووسینەکانی ئیبنو تەیمیەدا، ڕەنگە ئەگەر

بارودۆخ لەبار و دروست ببێت بتوانین هەستین بە دەرخستنی هەندێك لە لایەنەکانی ئەم پرسە لە نووسین و کەلەپوور و توێژینەوەی زانایانی تریشدا.

والله ولي التوفيق..

# پێڕست

# دکتۆر تەها جابر عطوانی



* ساڵی ١٣٥٤ ك- ١٩٣٥ ز لە عیراق لەدایك بووە.

* خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لە عیراق تەواو کردووە، ساڵی ١٣٧٨ ك- ١٩٥٩ ز بڕوانامەی باڵای لە کۆلێژی شەریعە و یاسا لە زانکۆی ئەزهەر وەرگرتووە.

* ساڵی ١٣٨٨ ك – ١٩٦٨ ز بڕوانامەی ماستەری لە کۆلێژی شەریعە و یاسا لە زانکۆی ئەزهەر وەرگرتووە.

* ساڵی ١٣٩٢ ك – ١٩٧٣ ز بڕوانامەی دکتۆرای لە (أصول الفقه)دا لە زانکۆی ئەزهەر وەرگرتووە.

* ساڵی ١٩٧٥ – ١٩٨٥ وەکو پرۆفیسۆری (فقه) و ئصولەکانی لە زانکۆی (ئیمام موحەممەد بن سعود)ی ئیسلامیی لە (ریاز) کاری کردووە.

* ساڵی ١٩٨١ بەشداریی لە دامەزراندنی پەیمانگەی جیهانیی فیکری ئیسلامییدا کردووە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

* سەرۆکی پەیمانگە و ئەندامی ئەنجومەنی ئەمیندارەکانی بووە.

* ئەندامی ئەنجومەنی دامەزراندنی رابیتەی جیهانی ئیسلامییە لە مەککەی پیرۆز.

* ئەندامی دەستەی فیقهی ئیسلامیی نێودەوڵتییە لە (جەددە).

* سەرۆکی ئەنجومەنی فیقهیی ئەمریکای باکوور بووە.

* لێکۆڵینەوەی لە کتێبی (المحصول في علم أصول الفقه)ی ئیمام فەخرەددینی رازی کردووە کە شەش بەرگە.

* چەندین کتێب و توێژینەوەی تری لە بوارەکانی (فقه) و (أصول الفقه)دا بە زمانەکانی عەرەبی و ئینگلیزی هەیە، لەوانەش:

– الاجتهاد والتقليد في الاسلام.

– أدب الاختلاف في الاسلام.

- أصول الفقه الاسلامي: منهج بحث ومعرفة.
- الأزمة الفكرية المعاصرة: تشخيص ومقترحات علاج.
- Outline of a Cultural Strategy.
- The Quran and the Sunnah: Time- Space Factor.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الکليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاراستەکردنی کاروانی ژیاریی مرۆڤایەتی و بەرچاورۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە، هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

– هاوکاریی هەوڵ و کۆششی زانا توێژەرەوەکانی زانکۆ و بنکەکانی توێژینەوەی

زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

– ئاراستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لەپێناو خزمەتکردن بە فیکر و مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لەڕێگەیانەوە کار و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبی و ئیسلامیی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستی هاوبەش، هەیە.